# بەرنامەی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی

## (بەڵگەنامەی بنەرەتیی یەکێتی فیدراڵیستیی جیهانیی پارتە سیاسییە لیبراڵیستەکان)

وەرگێڕانی

**ئەبوبەکر ساڵح ئیسماعیل**

هەولێر - ٢٠١١


دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **بەرنامەی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتیی**
- **وەرگێڕانی:** ئەبوبەکر ساڵح ئیسماعیل
- **نەخشەسازی ناوەوە:** ڕێدار جەعفەر
- **بەرگ:** وریا بوداغی
- **نرخ:** (١٥٠٠) دینار
- **چاپی یەکەم:** ٢٠١١
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەلات** (هەولێر)

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٢١٠) ساڵی (٢٠١١)ی پێی دراوە**

زنجیرەی کتێب (٦١١)





**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## ناوەڕۆك

## نێودەوڵەتیی

لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیی بە (یەکێتیی فیدڕالیستیی نێونەتەوەیی پارتە سیاسییە لیبڕالیستەکان) دادەنرێ و لە ساڵی ١٩٤٧ دامەزراوە و وایلێهات کە بووە یەکەمین تۆڕێك بایەخ بە پتەوکردنی لیبڕالیزم و بەهێز کردنی پارتە لیبڕالیستەکان بدات، و گرنگیی بە بڵاوکردنەوەی دیموکراسیی لیبڕالیزم بدات لە هەموو گۆشەیەکی دونیادا. پارتە لیبڕالیستەکان، چ لە ئەفەریقا، ئەمەریکا، ئاسیا یان ئەوروپا بێت لە ژمارەیەك پرەنسیپی هاوبەشدا یەکانگیر دەبنەوە کە گرنگترینیان: مافەکانی مرۆڤ، هەڵبژاردنی ئازادانەی خاوێن، دیموکراسی دامەزراو لە سەر بنەمای فرە حیزبیی، دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، لێکبوردن، ئابووری بازاری ئازاد، پارێزگاریکردن لە ژینگە و هەستی بەهێز بەرامبەر بە هاوکاری نێودەوڵەتی. کاتێکیش دێینە سەر باری پیادەکردنی ئەو پرەنسیپانە بەپێی هەلومەرجی نەتەوەیی و نیشتمانی جیا جیا، هەر بە سروشتی حاڵ فرە جۆریی لە ڕێگاکانی پیادە کردن لە پارتێکەوە بۆ پارتێکی دیکە دەبینین. بەڵام هەموو ئەندامان پابەندی ئەو بەندانەن کە لە بەیاننامە (مانفێست)ی ڕێکخراوەکەدا هاتووە.

## لیبڕالیزم

لیبڕالیستەکان پابەندی بنیاتنان و پاراستنی کۆمەڵگای ئازاد و دادپەروەر و کراوەن ئەو کۆمەڵگایانە بریتین لەوانەی کە لیبڕالیستەکان لە ڕێگایانەوە هەوڵ دەدەن بۆ گەیشتن بە هاوسەنگی لە بەینی بەها بنەڕەتییەکان، کە خۆی لە ئازادی و یەکسانیی وپەیوەندیی بەردەوامی نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا بەرجەستە دەکا. لە کۆمەڵگایەکدا کە تێیدا هیچ مرۆڤێك ناچار نابێ ملکەچی، کۆیلایەتی، هەژاریی، نەزانیی یان ژێر فەرمانیی ببێ. لیبڕالیزم بانگەوازی ئازادی و کەرامەت و خۆشگوزارەنیی تاکەکان دەکا.



هەروەکو ئیقرار و ڕێز لە مافی ئازادیی دەربرین و مافی هەمووان لە گەشەپێدانی ئەو بەهرانە دەکا کە هەیانە. لیبڕالیزم ئامانجی دابەشکردنی دەسەڵاتە بۆ ئەوەی چاودێریی فرە جۆریی بکاو داهێنان لە ئامێز بگرێ. ئازادیش لە داهێنان و ئەفراندن نایەتە بوون و درێژەی نابێ تەنیا لە ڕێگای ئابوریی بازاری ئازادەوە نەبێ، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە دەبێ ئەم بازارە سەربەستیگەلێکی راستەقینە پێشکەشی خەڵك بکا. ئەم کارەش بەو واتایە دێ کە لیبڕالیستەکان لە لایەکەوە هەموو شتێکی ئەو بازارە ڕەتدەکەنەوە کە تێیدا ئازادی لە ڕێگای پاوانکارییەکانەوە کۆتوبەند دەکرێ ولە لایەکی دیکەشەوە ئەو ئابورییەی کە لە بەرژەوەندییەکانی هەژاران وکۆمەڵگا وەك گشت لێك جیا دەبێتەوە.

لیبڕالیستەکان گەشبینن و متمانەیان بە خەڵك هەیە، لە هەمان کاتدا ئیقرار بەوە دەکەن کە پێویستە لە هەمبەر ئەو کەسانەی کە جڵەوی دەستەڵاتیان بە دەستە وریایی و هۆشیاریی هەبێ.

## مافەکانی مرۆڤ

مافەکانی مرۆڤ دەکەوێتە ناو دڵ و گەوهەری لیبڕالیزمەوە. ئێمە باوەڕمان وایە کە ئەم مافانە مەرجی بنەرەتی پێشکەوتن و سەقامگیریی پێکدەهێنن وتەنیا لە ڕێگەی دیموکراسیەتێکی راستەقینەش نەبێ دەستەبەر ناکرێن. لیبڕالیستەکان ئیقرار بەوە دەکەن کە پێداویستییەکی راستەقینە هەیە بۆ بەهێز کردنی مافە سیاسیی و شارستانییەکان، هەر بۆیە ئەوان بەرهەڵستیی هەموو شێوە و جۆرەکانی دیکتاتۆریەت دەکەن. هەروەها فێر کردن و هێنانە دی مافەکانی ئافرەت و ڕێزگرتنی ژینگە بە کاروبارە پێویستەکان دەزانن. هەروەها ئێمە هەوڵدەدەین رمێن بە مافەکانی کەمینەکان بدەین، ئەمەش لەو کاروبارانەیە کە دەچێتە ناو خانەی خزمەت بە بەرژەوەندی گشتیەوە، چونکە ئێمە هەمووومان بە شێوەیەك لە شێوەکان بریتیین لە کەمینەکان.

## بازرگانیی ئازاد و گەشەپێدان

لیبڕالیستەکان باوەڕیان وایە ئەو هەژارییەی کە لە زۆر شوێنی جیهاندا باوە، دەکرێ لە ڕێگای ئازادیی سەفەر و بازرگانییەوە لە گوڕوتینی کەم بکرێتەوە. بە هێنانەدی ئەم ئامانجەش ئێمە پابەندین بەوەی کە بازاڕەکانی ((ڕۆژئاوا)) لە بەردەم ئەو بەرهەمانەدا بکەینەوە کە لە دەوڵەتانی جیهانی تازەگەشەسەندووەوە دێنە ناوەوە. بەڵام ئابوری بازاڕی کۆمەڵایەتی، بێگومان دەبێ دامەزراوە دیموکراسییەکان لەگەڵ خۆیدا بهێنێ. چونکە پارەدان بۆ گەشەپێدان ناتوانێ هاوکاری سنووردانان بۆ هەژاریی بکا تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێ کە ئەو حکومەتانەی کە ئەو هاوکارییە وەردەگرن فەرمانرەواییەکی ژیرانە بنیاتبنێن کە روونبینییەکی تەواو[1] و لێپرسینەوە و بەرپرسیارێتییەکی دامەزراو لەسەر بنەمای سەروەریی قانون تێیدا بەرجەستە ببێ. بەڵام بێ ئازادی و کرانەوە و بژارە و جێگیرەوەی سیاسی[2] و دامەزراوەی سەربەخۆ کە لەسەر بنەمای جێبەجێ بوونی بڕگەکانی قانوون دامەزرا بێ، هیوایەك بۆ جڵەو کردنی سەر کێشیەکانی گەندەڵیی یاخود هێنانە دی گەشە پێدان بوونی نابێ. هەر لە بەر ئەم هۆیەشە کە لیبڕالیستەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کە هیچ گومان لەوەدا نییە کە دەبێ ئەو هاوکارییەی ئاراستەی گەشەپێدانی نێودەوڵەتیی دەکرێ، بە نۆرەی خۆی تەئکید لە سەر گەشەپێدانی دامەزراوە سیاسیەکانیش بکاتەوە.

---

1- شفافية تامة

2- البديل السياسي

# بەشی دووەم

## بەیاننامەی ئۆکسفۆرد* ١٩٤٧

* ئەم بەیاننامەیە لە کاتی کۆنگرەی لیبڕالیستیی نێودەوڵەتیی دەرچووە کە لە کۆلیژی وادهام لە شاری ئۆکسفۆرد لە نیسانی ١٩٤٧دا بەستراوە.

## فیدراڵیزمی نێودەوڵەتیی

ئێمەی لیبراڵیستانی نۆزدە دەوڵەت کە لە ئۆکسفۆرد کۆبووینەتەوە، لە کاتێکدا کە پشێوی و هەژاری وبرسێتی وترسێك بە خۆوە دەبینێ کە هەر هەمووی لە ئاکامی هەردوو جەنگە جیهانییەکەوە سەریهەڵداوە، لەو قەناعەتەمانەوە کە حاڵەتی جیهان بەجۆرە کە ئێستا هەیەتی، لە پلەی یەکەمدا بۆ بەلاوە چوونی پرەنسیپەکانی لیبراڵیزم دەگەڕێتەوە، ئێمە بەم بەیاننامەیە جەخت لە سەر باوەڕی خۆمان دەکەینەوە کە:

### یەکەم

١- مرۆڤ هەر لە سەرەتا و کۆتایی، بوونەوەرێکە کە پەروەردگار بە توانای بیرکردنەوە، کارکردنی سەربەخۆ و توانای جیاکردنەوەی چەوت لە راست، خۆشەویستیی خۆی پێبەخشیوە.

٢- رێزگرتنی کەسیی مرۆڤ وقەوارەی خێزان بنەمای بنچینەیی هەر کۆمەڵگایەك پێکدەهێنن.

٣- دەوڵەت تاکە ئامرازێکی بەڕێوەبردنی هەر کۆمەڵگایەك پێکدەهێنێ، و پێویستە ئامادە نەبێ نوێنەرایەتی هیچ دەسەڵاتێك بکا کە لەگەڵ مافە بنەڕەتییەکانی هاوڵاتیاندا ناکۆکە یاخود لەگەڵ ئەو هەلومەرجانەدا یەکناگرێتەوە کە بۆ خولقاندنی ژیانێکی بەرپرسیارانە، کە رووخساری داهێنانی بەبەرخۆیدا پۆشیوە، کە بە دیاریکراوی ئەمانەی خوارەوە دەنوێنێ:

- ئازادیی تاکە کەس، کە سەربەخۆیی لە بەڕێوەبردنی قانوون و دادپەروەریی دەستەبەری دەکا:

* ئازادیی پەرستن و ئازادیی ویژدان.
* ئازادیی رادەربڕین و ئازادیی رۆژنامەگەریی.
* ئازادیی کۆبوونەوە یان کۆنەبوونەوە.
* ئازادیی هەڵبژاردنی وەزیفە.



- دەرفەت رەخساندن بۆ فێربوونی تەواو و هەمە جۆر بەپێی تواناکانی خۆی بێ گوێدانە رەچەڵەك یان توانای مادی.
- مافی بوونی موڵکدارێتیی تاکە کەس و مافی هەڵسوڕان لە چالاکیی بازرگانیی تاکە کەسیدا.
- هەڵبژاردنی ئازادانەی بەکاربەر، دەرفەت رەخساندن بۆ کەڵك وەرگرتن لە هەموو ئەو سیفەتانەی کە لە ئەنجامی بەرهەمهێنانی خاك و زەوی و لە ئەنجامی کاری مرۆڤ لە پیشەسازییەوە دێت.
- بەهرەمەند بوون لە ئاسایش لە هەمبەر مەترسییەکانی نەخۆشی یان بێکاریی یان پەککەوتەیی یان پیریی.
- یەکسانیی لە مافەکان لە نێوان پیاوان وژنان.
- ئەم ماف ومەرجانە تەنیا دیموکراسیی دەتوانێ دەستەبەریان بکا. دیموکراسیی راستەقینە لە ئازادییە سیاسییەکان جیا نابێتەوە و لە سەر بنەمای ویژدان و رێککەوتنی ئازاد و رۆشن لە نێوان تاکەکانی زۆرینەدا دادەمەزرێ کە لە رێگای دەنگدانی نهێنیی وئازادەوە گوازشت لە و رێککەوتنە دەکرێ لەگەڵ رێزگرتنی ئازادیی راکانی کەمینەکانی دیکە.

### دووەم:

١- هیچ سێوودوو لەوەدا نییە کە پاکتاوکردنی ئازادیی ئابووری بۆی هەیە ببێتە هۆی نەمانی ئازادیی سیاسیی. ئێمەش لە بەرامبەر ئەو پاکتاوکردن و زۆرلێکردنەدا لە هەڵوێستی ئۆپۆزسیۆندا دەبین جا ئەمە لە سەرینی موڵکدارێتی دەوڵەتەوە هاتبێ یان لە ئەنجامی زاڵبوونی قۆرخکاریی تایبەت و یەکێتییەکانی قۆرخکاریی و سندوقەکانی پارە پێدانەوە هاتبێ. بەڵام ئێمە ئیقرار بە موڵکدارێتی دەوڵەت تەنیا بۆ ئەو پرۆژانە دەکەین کە لە توانای دامەزراوە تایبەتەکاندا نییە هەنگاوی بۆ بنێ یاخوود بە هۆی ئەوەوە کە کێبەرکێ رۆڵی تێدا دەگێڕێ.

٢- بێ سێوودوو هەر دەبێ خۆشگوزەرانیی باڵ بە سەر کۆمەڵگادا بکێشێ و پاراستنی ئەمەش لە پاراستنی لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لە لایەن بەرژەوەندە تایفییەکان خۆیدەنوێنێ.

٣- پێویستە بە بەردەوامی کار بۆ چاککردنی هەلومەرجی کارکردن بکرێ لەگەڵ هەوڵدان بۆ چاککردنی نیشتەجێ کردنی کرێکاران و چاککردنی ژینگەی دەوروبەریان.

ماف و ئەرك و بەرژەوەندەکانی کرێکاران و سەرمایە هەموویان بە تەواوکەری یەکتری دادەنرێن، هەر بۆیە راوێژی رێکوپێك و هاوکاری بەردەوام لە نێوان کرێکار و خاوەن کاردا بە فاکتەرگەلێکی گەوهەریی دادەنرێن کە بووژانەوەی پیشەسازی دێنێتە دی.

### سێیەم:

خزمەتگوزاریی بە فاکتەری تەواوکەری ئازادی دادەنرێ و لە هەمبەر ئەمەدا هەموو مافێك ئەرکێکی هەیە. جا بۆ ئەوەی دامەزراوە ئازادەکان بە لێهاتوویی کار بکەن، پێویستە لە سەر هەموو هاوڵاتییەك کە هەستی بەرپرسیارێتییەکی رەوشتیی لە بەرامبەر براکانی لە تیرەی ئادەمیزاد تێدا بێ، وێرای رۆڵێکی چالاکانە لە کاروباری کۆمەڵگادا.

### چوارەم:

دەست هەڵگرتنی یەکجارەکیی لە شەڕ و شۆڕ، کارێکە لە توانادایە و گێڕانەوەی ئاشتیی جیهانیی و بووژانەوەی ئابووریش تەنیا لە یەك حاڵەتدا دەرەتانی دەبێ کە ئەویش لە هێنانە دی ئەم مەرجانەی خوارەوەیە لە لایەن گەلانەوە:

ا- پابەندبوونێکی توندوتۆڵ بە رێکخراوەیەکی جیهانیی کە هەموو گەلانی جیهان بە گەورە و بچووکیەوە لە خۆ بگرێ بە رەنگێك کە هەر هەموویان ملکەچی یەك قانوون و دادپەروەریی بن، هەروەها ئەم رێکخراوە، بەهرەمەندبێ لە دەسەڵاتێکی



چاودێری بەسەر پابەندبوونێکی توندوتۆڵ بە هەموو پەیماننامە نێودەوڵەتیەکانییەوە، کە گەلان بە ئازادییەکی تەواوەوە چوونەتە ناوییەوە.

ب- رێز گرتنی هەموو نەتەوەیەك لە بەهرەمەند بوونی بە ئازادییە پێویستیە مرۆییەکانی خۆی.

ج- رێزگرتنی زمان و باوەڕو قانوون و نەریتەکانی کە کەمینەکان هەیانە و پراکتیکی دەکەن لە گشت دەوڵەتانی جیا جیادا.

د- ئالۆگۆڕی ئازادانەی هزر و هەواڵ و خزمەتگوزاریی لە نێوان گەلاندا سەرەڕای ئازادیی سەفەر لە ناوەوەی دەوڵەتان وهەروەها لە نێوانیانیشدا بێ ملکەچ بوون بۆ کۆتوبەندەکانی چاودێریی یان بەربەستەکانی بازرگانی یان رێوشوێنی ئەوتۆ کە ئالۆگۆر کۆتوبەند دەکا.

ه- گەشەپێدان و برەودان بە ناوچەدواکەووتووەکانی جیهان بە هاوکاری لەگەڵ دانیشتووەکانی خۆیان بە رەنگێك کە لەگەڵ بەرژەوەندەکانی جیهانیشدا هاوئاهەنگ بێت.

ئێمە بانگەوازی هەموو ئەو پیاو و ژنانە دەکەین کە بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ ئەم هزر و پرەنسیپە نموونەییانەدا هاوڕان، کە بێنە پاڵ ئەم هەوڵانەی ئێمە بەرەو قبوڵکردنی لە گشت گۆشەیەکی جیهاندا.

**ئێمەی لیبڕالیستانی سەر بە بیست دەوڵەت کە بە بۆنەی ئاهەنگی تێپەر بوونی بیست ساڵ بەسەر (جاڕنامەی لیبڕالیستی) و دامەزرانی لیبڕالیزمی نێودەوڵەتی لە ئۆکسفۆرد کۆبووینەتەوە:**

*دووبارە تەئکید لە سەر پرەنسیپەکانی لیبڕالیزم دەکەینەوە هەروەکو کە لە (جاڕنامەی لیبڕالیزم)دا پێناسە کراوە

*ئێمە خۆشحاڵین ئەو پرەنسیپانە، کە لە میانی ئەو بەیاننامانەوە کە لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەرچووە، پەسند کراون و هەروەها چوونەتە نێو ئەو دەستوورانەوە کە زۆرێك لەو ولاتانەی کە تازە سەروەری خۆیان بە دەستهێناوە و لە سەر بەرنامەی ئەو دەستوورە دەڕۆن.

*لەبەر رۆشنایی ئەو پرەنسیپانە، رای پەسندکراوی خۆمان لە بارەی ئەو پەرەسەندنانەوە رادەگەیەنین کە لە ماوەی بیست ساڵی رابردوودا روویانداوە.

## ئەرکی راسپێردراو بە لیبڕالیزم لە رووبەرووبوونەوەی شۆڕشی ئێستا لە مەڕ کاروباری مرۆڤایەتی

١- شۆڕشێك کە کاری کردووە و ئێستاش کار دەکا لەسەر گۆڕینی رێرەوی مرۆڤایەتی بە درێژایی ئەو چەند سەدە کەمەی رابردوو لە رابردوو و ئێستاشدا هێزێکی پاڵنەری زیاتر بە دەست دەهێنێ.

*ئەو هاوئاهەنگییە پەرەسەندووە لەگەڵ گۆڕانکارییە زانستی و تەکنیکیەکان، گۆڕانکاری لە بواری زانستەکانی بۆشایی ئاسمان و ئامێرسازی، هێزی ئەتۆمیی لە بواری ئاشتیی وجەنگ، پەیوەندی بەردەوام لە میانەی ئامرازەکانی راگەیاندن، پووڕەدانی دانیشتوان[3] شۆڕش لە بواری خۆشگوزەرانیی و خزمەتگوزاریی گشتی، گەشەسەندنە جیهانییەکان کە سیستەمی پیشەسازیی بە

3- الأنفجار السكاني



خۆیەوە دەبینێ و جێگای کۆمەڵگای لادێنشین دەگرێتەوە و هەروەها ئەو سەربەخۆییەی کە هاتۆتە دی و جۆرێك لە گەلان بانگەشەی بۆ دەکەن هەموو ئەو کاروبارانە بوار بۆ زۆر دەرفەتی نوێ دەکاتەوە لە بەردەم پێشکەوتنی مرۆڤایەتی. لە هەمان کاتدا، لە جیهانێکدا کە مەودای جیاوازیی نێوان دەوڵەتانی دەوڵەمەند و ئەو دەوڵەتانەی کە کەوتوونەتە نێو چنچڕوکی هەژاری و برسیەتی، روو بە زیادی زیاترە و ئەمەش بە پاکتاو کردنی ئازادیی دەژمێردرێ، و بەدەست هەڵاواردن و نەتەوەگەرێتی دەمارگیرییەوە ئازار دەچێژێ.

هەموو ئەو گۆرانکارییانە دیسانەوە کۆمەڵ خولیایەك دەخولقێنن بە ئاراستەی چربوونەوەی دەسەڵات و ستەم و وێرانکاریی لە سەر ئاستێك لە جیهاندا کە پێشتر وێنەی نەبووە.

٣- هەر بۆیە لەم سەردەمەی ئێستادا ئەرکی بنەرەتیی لەوەدا خۆی دەنوێنی کە ئەو هێزانە بگۆڕین بۆ خزمەتگوزاریگەلێك کە مرۆڤایەتی لێی بەهرەمەند بێت. ئامرازەکانی رێنوێنیکردنی ئەو هێزانەش لە شێوە و رووخساری مادیدا بەرجەستە نابێ، بەڵکو لەوەدا کە لە گشت گۆشەیەکی سەر زەویدا گەشە بەو کۆمەڵگا ئازادانە بدرێ کە هاوڵاتیانی رۆشنبیرو بەرپرس دەگرێتە خۆی و لە سەرینی کۆششی هاوبەشی ئەو هاوڵاتییانەوە ملکەچ دەبن بۆ پارێزگاریی لە بەرامبەر ترس و هەژاریی و ستەمی ناوخۆیی و دەرەکیدا. وێنەی ئەم کۆمەڵگایە ئازادانە تەنیا لە میانی کارکردنی هەمیشەیی بە پرەنسیپەکانی لیبڕالیزم، دەتوانرێ دابمەزرێ.

## ناناوەندیی و ئازادی

٤- یارمەتیی وهاوکاریی لە نێوان مرۆڤە ئازادەکان لە جیهانی نوێدا بە پێویستییەکی گەشەسەندن دادەنرێ. بەڵام خولیای ناوەندگەرێتی ناتەندروست، بووە هاندەری داتەپینی دامەزراوە پەرلەمانییەکان، پشت بەستنێکی زێدەڕۆیانەی تاك بە دەوڵەت، پەرەسەندنی شێوەگەلێکی نوێ لە ئیستبداد و ناوەندگەلێکی نابەرپرس لە

دەسەڵاتدا لە میانی گەشەکردنی بیرۆکراسییەتێکی بەدەر لە ملکەچکردن بۆ چاودێری، پێکهاتنی قۆرخکاریی گشتی و تایبەت و کۆتوبەند بوونی خاوەن کار و کرێکاران.

٥- لەو باوەڕداین کە ئەم ئاراستانە دەتوانرێ لە ڕێگەی چڕبوونەیەکی جیدی لە سەر پێویستیی ئازادییەکی سەرتاپاگر لە هەموو بوارەکاندا، قەڵاچۆ بکرێ، بە تایبەتیش لە ڕێگەی گواستنەوە و بڵاوکردنەوەی هەرە گەورەی دەسەڵات لە بواری ئابوری و کۆمەڵایەتی و حکومی لە میانی کاری توندوتۆڵ لە میانەی قۆرخکاریدا.

ب- پارێزگاری کردنی فرەجۆریی بەربڵاو لە گوزارشت کردن و دەستپێشکەری لە هەموو کاروبارێکی فێرکردن و کولتوور وێرای پەیوەندی بەردەوام لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەوە.

ج- ڕەخساندنی گشت زانیارییەکی پێویست لە پێناوی ئەوەی کە هاوڵاتی توانای ئەوەی هەبێ ڕای بابەتییانە لە بارەی هەموو کاروبارێکی پەیوەست بە بەرژەوەندی گشتی گەڵاڵە بکا.

د- پارێزگاریکردنی مافەکانی کەمینەکان لە بەهرەمەند بوونیان لە گشت ئازادییە پێویستەکان هەروەکو لە (جاڕنامەی لیبرالیستی)دا هاتووە.

هـ- لەناو بردنی هەڵاواردنی نەژادیی و گشت شێوەکانی پاکتاو کردن.

و- پارێزگاریکردنی تاك و کۆمەڵ لە هەموو شێوەکانی غەزوی ستەمکارانە بۆ سەر ژیانی تاکەکەس وەکو سیخوڕیی ئامێریی.

## سیاسەتی ئابووری و گەشەپێدان

٦- باوەڕمان وایە کە ئەو پلانەی کە حکوومەتەکان بۆ چالاکییە ئابوورییەکانیان دایدەڕێژن پێویستییەکە کە دەرەتانی وەلانانی بۆ نییە، بەڵام ئەمە مەرجێکە کە بۆ کەنارخستنی سەربەخۆیی کەرتی تایبەت لە ئابووریدا، یان بۆ میکانیزمی نرخ لە بازاری ئازاددا بەکار نەیەت، چونکە ئەمانە کاروبارێکن کە پێویستییان بە کێبەرکێی ئازاد هەیە. هەموو ئەو کاروبارانە، بە بنەماگەلی پێویست دادەنرێن بۆ



دەستەبەرکردنی گەشەپێدانی ئابووریی و گەورەکردنی بەرهەم وبەکارهێنان و لەمەشەوە بۆ دابینکردنی کاڵاو خزمەتگوزاریی پێویست بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لە گشت وڵاتانی جیهاندا.

٧- باوەڕمان وایە کە کۆمەڵگا بەرپرسیارێتییەکی تایبەتی بە ئەستۆوەیە بۆ پاراستنی سەرچاوە سرووشتیەکان وسامانە کولتوورییەکان و جوانیی شارەکان و لادێکان لە بەرامبەر گەشەپێدانی کوێرانەدا جا چ لە ڕێگای کەرتی گشتی بێت یان تایبەتەوە بێت.

٨- زۆر بوونی ژمارەی دانیشتووان، کە بە هۆیەوە زیادبوونێکی گەورەی لە بەکارهێناندا بە دوادا دێت، بۆی هەیە ببێتە هۆکاری هەڵئاوسان، هەڕەشە کردن لە دەستکەوتی ئابوری و کۆمەڵایەتی و پێشکەوتن، ئەمەش لە ئاکامی پتەوکردنی ناسەقامگیری نەختینەیی. لە ژێر سایەی ڕژێمی دیموکراسی و ئازاددا دەتوانرێ هەموو ئەمانە لە ڕێگەی دیسپلینی خۆبەخشانە و هاوسەنگ لە لایەن دەوڵەت و گشت کۆمەڵەکانی کۆمەڵگاوە وەلابنرێن. ئەمەش دەبێتە کارێکی دیاریکراو کە کۆششەکان بە ئاراستەیەکدا بخرێنە گەڕ کە گرنگییەکی گەورە لە هەموو دەوڵەتاندا بۆ ئەو سیاسەتانە بێت.

## یارمەتیی نێودەوڵەتیی ئابوری

٩- باوەڕمان هەیە بە پێویستیی ئازادیی جوڵانەوەی کەسەکان و کاڵاکان وسەرمایە و خزمەتگوزارییەکان، وپێویستیی دابەشکردنی نێودەوڵەتیی بۆ کار و یارمەتیی نێودەوڵەتیش لە سەر فراوانترین ئاستدا لە گشت کاروبارێکی نەختینەیی و کۆمەڵایەتی و تەکنیکی کە لە تواناد هەیە.

١٠- بانگەواز بۆ گردبوونەوەی ئابووری و هەرێمیی دەکەین، بەڵام بە مەرجێك ئەو گردبوونەوانە نەبێتە ئامرازێك بۆ پاراستنی هەرێمیی، یان بۆ قۆزتنەوەی ئابووری لە لایەن دەوڵەتێکەوە لە بەرامبەر دەوڵەتانی دیکەدا، و ئەم کۆمکارییە تووشی داڕمانێك نەبێ تا ببێتە جۆرێك لە جۆرەکانی حوکمی تەکنوکراتی بیروکراتیی لە دەرەوەی سیستەمی چاودێری دیموکراسی.

## یەکسانیی و خۆشگوزەرانیی

١١-باوەڕمان وایە کە پاڵێکی گەورە لە سامانی زێدە، بێگومان دەبێ بۆ پتەو کردنی یەکسانکردنی دەرفەتەکان بۆ هەموو تاکەکان ونەتەوەکان بخرێتە کار لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا.

١٢- ئەم کارە بۆ تاکەکەس، ئاسایش لە مەترسیەکانی نەخۆشیی و بێکاریی و پەککەوتەیی و پیریی لەگەڵ دابین کردنی خانووی گونجاو دەگرێتە خۆی.

١٣- هەروەها ئەم کارە پێویستیی بە فەراهەم کردنی باشترین توانایەك کە لە بەر دەست دایە بۆ فێر کردنی هۆشیاریی و مرۆیی و هونەریی بۆ هەمووان بێ گوێدانە چینی کۆمەڵایەتی یان توانای مادی. بۆ ئەم مەبەستەش وامان بەلاوە پەسندترە کە گەورەترین رووبەرێك کە لە تواناداپە لە سیستەمەکانی فێر کردن دابین بکرێ کە ملکەچی پێوەرە ئەکادیمیەکان وتوانای دامەزراوەکانی فێر کردن بێ بۆ پێگەیاندنی هاوڵاتیانی ئازاد و بەرپرس.

١٤- هەروەها ئەمە پێویستیی قەڵاچۆ کردنی هەستکردن بە نامۆیی لە بەینی فەرمانبەران لە میانی بەخشینی مافی بەشداریکردنێکی بەرپرسانە لە بەڕێوەبردن و سەقامگیریی و گەشەپێدانی ئەو دامەزراوانە کە کاری تێدا دەکەن لەگەڵ توانا بەخشین پێیان بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندێکی دارایی.

١٥- بێگومان دەبێ رێکخستنی خێزان لەگەڵ رێزگرتنی تەواو لە بەرپرسیاریی هاوسەرەکان و ئازادیی هەڵبژاردنیان بەرێوە ببرێ.

١٦- لە سەر ئاستی نێودەوڵەتیدا ئەم کارە بریتیە لەوە کە لەلایەن دەوڵەتە پیشەسازییە گەورەکانەوە سیاسەتی بازرگانیی لیبراڵ کە بە چاوی بایەخەوە برێکی گونجاو لە پێداویستی تایبەت بۆ بەشە هەژارەکانی جیهان و دابینکردنی پشتیوانیی دارایی و هونەریی بۆ پارمەتیدانی ئەو بەشە هەژارانە بۆ دانانی بنەمایەك لە سیستەمەکانی دڵنیایی فێر کردن و کۆمەڵایەتی، خولقاندنی ژێر خانی پێویست بۆ بەر فراوانبوونی ئابوری و بەهێز کردنی گەشە پێدانی کشتوکاڵیی و پیشەسازیی.



١٧- باوەڕمان وایە کە ئەو یارمەتییەی پێشکەشی ناوچە هەژارەکان دەکرێ، مەرجی ئەوەی تێدا نییە کە بە هۆکاری خۆپەرستانەی سیاسی یان ئابووری پێشکەش بکرێ. هەروەها تەئکید لە هاوکاریی نێوان دەسەڵاتەکان و دانیشتوانی ئەو ناوچانە دەکەینەوە، لەگەڵ گەشەپێدانی هەستی ئازادی و دەستپێشکەریی و بەرپرسیاریی. لەوەش کە ئەم ئامانجە دەکەینە نووختەی سەرنجی خۆمان، باوەڕمان وایە کە هاوئاهەنگییەکی باش لە نێوان لایەنە حکومییەکان و دامەزراوە تایبەتییەکان و رێکخراوە خۆبەخشەکان پێویستیەکە کە وەلاوەنانی دەرەتانی نییە.

## ئاشتی و ئازادی

١٨- باوەڕمان وایە نەتەوە یەکگرتووەکان، کە لە سەر پرەنسیپی دیموکراسیی لیبراڵ و گەشەپێدانی رەوشتێکی هاوبەشی نێودەوڵەتیی دامەزراوە، بە رەچاوکردنی ئەو خاڵە لاوازانەش کە لە ئێستادا هەیەتی، شایانی ئەوەیە کە لە لایەن گەلانی جیهانەوە پشتیوانیی لێبکرێ کە هەوڵدەدەن بیکەن بە دەسەڵاتێکی کاریگەریی نێودەوڵەتیی، کە خاوەنی وەزیفەگەلێکی دیاریکراو و دەسەڵاتێکی راستەقینە بێ و توانای جێبەجێکردنی سەروەریی قانوونی هەبێ لە پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکاندا.

١٩- باوەڕمان وایە کە بەرژوەندییەکانی گەلان، بەرژەوەندییەکانی وڵاتان دەگرێتەوە و لە کاتی ئێستادا پێگەی خۆی لە نێو شارستانێتییەتەکانی تەکنەلۆژیای جیهانی ئەمرۆدا گرتووە، دەتوانرێ بە شێوەیەکی نموونەیی لە رێگەی فەرمانرەواییکردنی گەلان لە لایەن خۆیانەوە بە پێی پرەنسیپەکانی دیموکراسی لیبرالیزم خزمەت بکرێ.

٢٠- باوەڕی خۆمان، کە چەندین جار گوتومانە، دەڵێینەوە کە ئاشتیی هەمیشەیی تەنیا لە رێگای ئازادییەوە دەتوانرێ زامن بکرێ و سیاسەتی لیبرالیستیی دەرەوە وا پێویستی دەکا کە هەر لە بنەمادا بە ئامانجی بەرفراوانکردنی رووبەری ئازادیی بێ لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا.

٢١- باوەڕمان بە پێویستی هەوڵدان بە دوای ئامانجێکی یەکجار سەخت هەیە کە ئەویش دانانی سنورێکی هاوسەنگ و چالاك و ملکەچیی بۆ چاودێریکردنی چەکەکانە. بۆ ئەوەش کە ئەم ئامانجە بێتەدی باوەڕمان وایە کە بێ سێودوو دەبێ نەتەوە ئازادەکان هاوکار بن لە پێناوی دابین کردنی پارێزگاریی دژی دەسدرێژیی بە چەکی ئەتۆمیی یان کلاسیکیی.

٢٢- خۆشحاڵین بە هەموو کۆمکارییەکی هەرێمیی لە هەر کیشوەرێك لە کیشوەرەکان لە سەر بنەمای یارمەتیی هاوبەش لە بەینی کۆمەڵگا ئازادەکان بە رەنگێك کە هۆکاری یەکگرتنەوەی نەتەوە خاوەن سەروەرییەکانە. لە مبارەیەشەوە هێنانە دی یەکێتی ئەورووپا کە لە بەردەم هەموو دەوڵەتانی ئەورووپادا ئاوەڵابووە، ئەرکێکە خۆ پەنادانی بۆ نییە و ئەرکێکی داسەپاوی سەرشانی ئەورووپییەکان خۆیانە لە پێناوی ئەوەدا کە بتوانن بە شێوەی چالاکییەکی گەورەتر، بەشداریی لە هێنانە دی ئاشتی و ئازادیی و خۆشگوزەرانیی سەرتاپای ئەم جیهانەدا بکەن.

لە کۆتاییدا هیوامان لە راگەیاندنی باوەری خۆمان لەوەدایە کە ئەرکی ئاراستە کردنی شۆرشی جیهان بەرەو قازانجی مرۆڤ، ئەرکێکی لیبڕالیستییە. ئەمەش پێویستیی بە لێکبووردن و هاوکاریی ئازادانە هەیە. هەروەکو پێویستیی بە هۆشیاریی لیبڕالیستیی هەیە بۆ پێداویستییە گەشە سەندووە مرۆییەکان و هۆشیاریی بە هزرە لیبڕالیستییەکان و دەستپێشکەرییە لیبڕالیستیەکان هەیە. هەروەکو پێویستیی بە حیزبگەلێکی لیبڕالیست هەیە کە بتوانێ کاریگەرانە، شوێنەواری خۆی لە سەر سیاسەتەکانی ولاتەکانی خۆیان دابنێن.

هەر بۆیە خۆشحاڵیی خۆمان بەو هەولانە رادەگەیەنین کە بە ئامانجی بیرکردنەوەو کارسازییە و هەروەها بەو گوشارانە کە لە کاردان و دەبینرێن لە ولاتانی نالیبڕالیستدا، چونکە ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوە کە پێداویستیی ئازادیی، تەنانەت لە تاریکترین هەلومەرجدا خۆی خۆی دەسەلمێنێ.

لە سەر ئێمەش پێویستە، بگرە ئارەزووشمان ئەوەیە کە هەرچی لە تواناماندا هەیە بیکەین لە پێناوی یارمەتیدان بۆ پێکهێنانی ئەم پەرەسەندنە بەرەو لیبڕالیزم.

## یەکەم: دیباچە

١- ئێمە لیبڕالیستانی ئەفەریقا و هەردوو ئەمریکا وئاسیاو ئوسترالیاو ئەوروپا، کە لە مێژووی سێپتامبەری ١٩٨١ لە رۆما کۆبوینەتەوە، لە کاتێکدا کە پێشێلکاریگەلێکی گەورە لە دژی مافەکانی مرۆڤ بەرچاو دەکەوێ، سەرەرای بارگرژیگەلێکی ترسناك کە هەڕەشە لە ئاشتیی ودیموکراسیی دەکەن.

أ- ئێمە لە بەردەم کاریگەریگەلێکی زێدەبووی ئەو گۆڕانکارییە گەورانەداین کە لیبڕالیزم رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی تێدا گێڕاوە، لەوانەی کە بە گۆڕانکارییەکی گەورەوە چەمکی پێناسە کردنی مرۆڤ و کۆمەڵگا و دەوڵەت و زانستەکان و تەکنەلۆژیا و سیاسەت و ئابووریی گۆڕیوە.

ب- ئێمە سوورین لە سەر کاریگەریی دانان لە سەر ئەو گۆڕانکارییە قووڵانەو دەرهاویشتە جیهانیەکانی بە ئاراستەی لیبڕالیزمدا، بە تایبەتیش مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ.

ج- ئیمانی خۆمان تەئکید دەکەینەوە بە بەهای بەردەوامی پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی لیبڕالیزم کە لە جاڕنامەی ئۆکسفۆرد لە ساڵی ١٩٤٧دا هاتووە.

د- لە رێگای جاڕنامەی ئۆکسفۆرد ١٩٦٧ تەئکید لە سەر ژمارەیەك لەو پەرەسەندنە بنەڕەتییانە دەکەینەوە کە لەم چەند دەیەی دواییدا روویانداوە.

هـ- رووی بانگەواز دەکەینە هەموو پیاوان و ژنان لە گشت ولاتاندا کە هیوایان بە ئازادییەوە قایم بکەن، بۆ ئەوەی بە ئیمان و تێگەیشتنێکی نوێوە، ئەرکی دەستەبەرکردنی مانەوە و هێزی کۆمەڵگای ئازاد بە ئەستۆ بگرن، لە میانی دەرخستنی هێزی بێ هاوتای خۆی بۆ گۆڕینی ئەو هێزە نوێیانە کە سەریان هەڵداوە و پەرەیان ستاندووە، لە بەرژەوەندی خزمەتکردنی مرۆڤایەتی، بۆ تێر کردنی پێداویستییە رۆحی و مادییەکانی گەلانی جیهان لە رێگای ئازادی.

٢- ئەرکی لیبڕالیزم، بە هۆی ژمارەیەك لەو راستییانەی کە دێن و سەری رێگاکە دەگرن، تادێ زیاتر دژوار دەبێ. تەمومژاوی ئەو هێزانەی کە لە جاڕنامەی ئۆکسفۆرد



لە ساڵی ١٩٦٧ دا وەسف کراون زیاتر بووە. ئێستا شێوەگەلی نوێ لە ئازادی سەریهەڵداوە و لەگەڵیدا هاوشان شێوەگەلی نوێ لە پاکتاوکردن سەریان هەڵداوە.

بۆیە لە سەرمان پێویستە شیکردنەوە و نەخشە و رێکخستن بۆ دامەزراوەی نوێ بکەین، لەگەڵ بەگەڕخستنی کۆششی توندوتۆڵ بۆ زامنکردنی قبوڵکردنی رای گشتی بۆ لیبڕالیزم. بێگومان دەبێ بە کۆششکردنەوە هەوڵ بدەین هاوسەنگییەکی نوێ بێنینە کایەوە لە نێوان دەستێوەردانی پێویستیی دەوڵەت و دەستپێشکەریی تاکە کەس، بێ ئەوەی خوودی دەوڵەت بۆ بیروکراسیەتێکی ستەمکار بگۆڕێ هەروەها پێویستە لە سەرمان کە لە سنووری دەوڵەتانی پیشەسازیی تێبپەڕین تاکو بتوانین جیهان سەرتاپای ببینین.

٣- بێگومان دەبێ پەی بە مەودا و قووڵایی ئەو بەرهەڵستییە ببەین کە حەتمەن لەگەڵ کۆمەڵە سیاسییەکانی دیکەدا رووبەروبوونەوە دێنێتە پێشەوە. هێندێك باوەڕیان وایە کە پرەنسیپەکان و روانینی ئێمە بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگا و دەوڵەت و ئابووری و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، هەر بۆ خۆی وا پێویست دەکا کە بەو رێساو دامەزراوانەوە پەیوەست بێ کە باوو باپیران دایانمەزراندووە. بەڵام بە پێچەوانەوە ئێمە ئیقرار دەکەین کە دوورکەوتنەوە لە رێگا و شێوازی کۆن بەرەنجامی فاکتەرگەلێکی نوێیە. ئەرکی ئێمەش لەوەدایە کە لەو فاکتەرانە تێبگەین لە پێناوی بەکارهێنانیان لە خزمەتی شێوە گەلی نوێ و هەمە جۆر بۆ کۆمەڵگایەکی دیموکراسیی لیبڕالیستیی بۆ دەوڵەت و ئابووری لە زەمەنی ئێستا و دوا رۆژیشدا.

## دووەم: پرەنسیپەکانی لیبڕالیزم و واقیعی ئێستا

٤- ئەو بەربەستانەی کە لە سەرینی بەیەکداچوونی پرەنسیپەکانمان و واقیعی ئێستاماندا رووبەروومان دەبێتەوە، لەمانەی خوارەوەدا خۆیدەنوێنێ:

أ- راستییەك کە دوولەسێی مرۆڤایەتی لە ژێر حوکمی رژێمگەلێکدا دەژین کە رێزی مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ ناگرن.

ب- جیاوازیگەلێکی رووبەزیادیی لە نێوان دەوڵەتانی دەوڵەمەندی خاوەن پیشەسازیی دامەزراو لە سەر بناغەیەکی پتەو و وڵاتانی تازە لە پیشەسازیدا، لەگەڵ دەوڵەتانی رووڵەگەشە کە خاوەن کەرەسەی خاو و سەرچاوەکانی وزەن و وڵاتانی فرە هەژار کە بە دەگمەن سەرچاوەیان هەیە.

ج- دارمانی ((مەرجەکانی ئاڵووگۆر)) لە بەینی مرۆڤ و سرووشت لە ئەنجامی گوشاری رووبەزیادبوونی دانیشتووان و پێداویستییەکانی مرۆڤ.

د- هەرەشەی رووبە زیادبوون کە رووبەڕووی ژینگە و چۆنیەتی ژیان دەبێتەوە.

ه- بارگرژیی توندوبەگوڕی نێوان دەوڵەتان و کۆمەڵەیەك لە دەوڵەتان بە هۆی تەماعکارییە ئیمپریالیستیی و نەتەوەیی و ململانێ و ئایدۆلۆجی و ترسە هاوبەشەکانەوە.

و- پێشبڕکێی خۆپڕچەککردن کە هەڕەشە لە مانەوەی مرۆڤایەتی دەکا.

ز- کەرت کەرتبوونەکانی ناو رژێمە دیموکراسییەکان لەوانەی کە لە سەر بنەمای پیشەسازیی دامەزراون، و هەستێکی بەرفراوان بە نائومێدیی لە هەمبەر ئەو کارو هەڵسووکەوتانە کە ئەنجامی دەدەن.

لە کاتی روانین بە هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە، ئەم بەربەستانە قەیرانێکی هەرە قووڵ دەنوێنن کە مرۆڤایەتی لە مێژووی درێژی خۆیدا، جا لە رۆژهەڵات بێت یان لە رۆژئاوا رووبەرووی بۆتەوە لە هەمبەر داخوازیگەلێکی شەرعیی بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی سیاسیی ودادپەروەریی کولتووری وهەروەها برێکی دادپەروەرانە لە سەرچاوەکانی داهات لە جیهان.

٥- ئەو جیاوازییە روو بە پەرەسەندووانە لە بواری سامان لە نێو دەوڵەتاندا، هەڕەشە لە ئاشتی و دیموکراسی دەکا لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا. بەها لیبڕالیستسییەکان بە تەنیا ئەوانن کە رێگا لە بەردەم ئازادی سیاسیی و تاکەکەسیی و گەشەپێدانی مادی دەکەنەوە. بەڵام لە کاتێکدا کە ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان بە دەست برسێتی و نەخۆشیی و دەربەدەربوون وبێکاریی وکەمیی هەلی کارکردنەوە، ئازار دەچێژن، ئەم ئازادییە هەڵدەتەکێت.



٦- نائومێد بوون یان ساردبوونەوە لە دیموکراسیی لیبراڵ، بە تایبەتی لە نێو لاواندا، بۆ ئەو تێکشکانە پاژەکییە دەگەڕێتەوە کە لە خولقاندن و پتەو کردنی بەها ئایدیالیستییەکان سەرهەڵدەدا، ئەمە سەرەڕای نەبوونی توانا لە تەرخانکردنی دامەزراوەکان لە پێناوی زامنکردنی هەرچی زیاتر لە دادپەروەریی و ئاستێکی باشتری ژیان.

لە هێندێك حاڵەتی نائاوێزیشدا ئەم نارازیبوونە بووەتە هۆی تیرۆر، هەروەکو لە هێندێك حاڵەتی دیکەدا بووەتە هۆی شێواویی لە فەرمانرەوایی یان رەتکردنەوەی بەشداریکردن لە ژیانی گشتی. بەهاکانی ئازادیی و سەربەخۆیی کە لیبڕالیزم رمێنی پێدەدا، دەتوانێ بە سەر ئەم بۆشاییەدا زاڵ ببێ، بە تایبەتیش کە لیبڕالیستەکان ئەمەیان روونکردۆتەوە کە ئازادیی بۆ تاکە کەس نابێ لەگەڵ خۆپەرستیدا تێکەڵ بکرێ، بەڵکو بریتییە لە ئازادیی لەنێو رەوتی کۆمەڵگا و بە واتای بەرپرسیاریی و هاوکاریی لەگەڵ گشت تیرەی ئادەمیزاددا.

٧- بەکردەوە ئەمە روون بۆتەوە کە سەرچاوەکانی وزە و کەرەسەی خاو، سەرەڕای زەوی پێویست بۆ کشتوکاڵ شیانی لە بن هاتنە. جا لە کاتێکدا کە هێشتا ژمارەی دانیشتووان لە زۆر شوێنی جیهاندا بە رێژەیەکی تۆقینەر روو لە زیاد بوونە، ولە کاتێکدا کە پێشبینی مادی بە بەردەوامی روو لە زیادبوونە، ئەوا دابینکردنی ئەم پێداویستیانە بەم گەشەکردنە سنووردارەی ئابووری بێ ئەوەی وێرانکارییەکی بێ قەرەبووی ژینگە، دەبێتە کارێکی مەحاڵ. بۆیە پاراستنی بەرفراوانی وزە و پەرە پێدانی وزەی نوێکەرەوە و هاوڕێی ژینگە، پێداویستییەکە کە وەلانانی دەرەتانی بۆ نیە.

٨- خۆپڕچەککردن لە ژمارەیەك لە ناوچەکانی جیهان سەرچاوەکانی ژیان کە دەکرێ بە باشیی بۆ چاککردنی هەلومەرجی گوزەرانیی ژیان رەنێوبهێنرێ، لە بەیندەبا، بە تایبەتیش لە نێو کۆمەڵ و دەوڵەتە هەژارەکان. لە دەمێکدا کە ئێمە ئیقرار بە ئەهمیەتی پێکهێنانی بەرگرییەکی گونجاو بۆ زۆرێك لە دەوڵەتان دەکەین، لیبڕالیستەکان بانگەواز بۆ میانڕەویی و حیکمەت دەکەن. جا ئەو جیهانەی کە ئاشتییەکی ملکەچ بۆ کاڕاستایی سەربازیی باڵی

بەسەردا کێشا بێ، ئەوا جیهانێکە لە مەترسیدایە. ئاشتیی و سەقامگیریی ماناگەلێکی زۆر زیاتریان لە بەرپەرچ هەیە. لیبڕالیزم پێویستیی بە دانانی سنوور بۆ هۆکارگەلی توندوتیژیی هەیە، و پێویستە ململانێ بە کاری سیاسیی و دیپلۆماسی بکرێ لە ڕێگەی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتووری.

٩- بۆ گیروگرفتەکانی مرۆڤایەتی، پێناسەیەك بە ناوی چارەسەرە کۆتاییەکان بوونی نییە، ((بە هەشتی خوا لە سەر زەوی)) بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان بوونی نیە. ئەو خولیایەی کە وا لێکدەدرێتەوە کە بۆ گەیشتن بە ڕێگەچارەی کۆتاییە بۆ سەختییەکان، ئەوە بنەرەتی فەندەمینتالیزمە، هەر بۆیە دەروازەی دیاریکراوی لیبڕالیستیی پشت بە ژمارەیەك پرەنسیپ دەبەستێ کە گرنگترینیان:

أ- گفتوگۆی بەردەوام و ڕەخنە و چاکسازیی لەو کاروبارانەن کە لە کۆمەڵگایەکی تەندروستدا دەستبەرداربوونی بۆ نیە.

ب- هیچ کەسێکی لیبڕالیست باوەڕی بە دەستەڵاتی موتڵەق نیە، بناغەی دەسەڵاتێکی شەرعیی لە ڕێککەوتندا خۆیدەنوێنێ، بەڵام چڕکردنەوەی زیاد لە سەر دەسەڵاتی حکوومەت، ئەم ڕێککەوتنە لە قاودەدا،جا بۆ ئەوەی ئەم ڕێککەوتنە بێتە دی، بێ سێوودوو دەبێ دەسەڵات دابەشبکرێ و ناوەندێتیی لە دەسەڵات، لە ڕێگای کۆمەڵێك دامەزراوەی بەرپرسیی دیموکراسییانەوە، دابماڵرێ.

ج- لیبڕالیستەکان ئیمانیان بە گوێڕایەڵیی بۆ ئارەزووی زۆرینە هەیە، ئەمە تەنیا لە حاڵێکدا نەبێ ئەگەر لەگەڵ مافەکانی مرۆڤ وپرەنسیپە بنەرەتییەکانی ئازادییدا ناکۆك بێت.

د- یەکسانیی لە کەرامەت و مافەکان ودەرفەتەکان، بۆ پاراستنی تاکە کەس لە مەترسییە مادییە بنەڕەتییەکانی ژیان، دابەشکردنی مولْکدارێتی وداهات بە دادپەروەرییەکی زیاتر لە کاروبارە پێویستیەکانن، بەڵام نابێ لەگەڵ یەکسانییەکی ڕووتدا تێکەڵ بکرێ.

هـ- لیبڕالیستەکان پشتیوانیی لە جووڵانەوە لیبڕالیستییەکان دەکەن، لەوانەی کە ڕووبەڕووی ململانێ لە پێناوی ئیستیبداد دەکەن، بۆ گەیشتن بە ئازادیی و دیموکراسیی



وێڕای بەردەوامبوون لە ڕەتکردنەوەی ئاشکرا لە هەمبەر بەکارهێنانی تیرۆر یان ڕێوشوێنی دیکە لە شێوەکانی توندوتیژیی ناو کۆمەڵگا دیموکراسییەکاندا.

و- لیبڕالیستەکان وایدەبینن کە پێویستە کاربکرێ بۆ هێنانە دی یەکسانیی لە بەینی پیاوان وژناندا، بە ڕەنگێك کە دەبێ ژنان وپیاوان هەمان دەرفەتی بە شدارییان لە گەشە پێدانی وڵاتەکانی خۆیاندا هەبێ.

## سێیەم: چەند دۆزێکی دامەزراوەیی دیموکراسییە نوێیەکان

١٠- لیبڕالیزم پێویستیی بە چاکسازیی بەردەوامی دامەزراوە دیموکراسییەکانە.لەمەشدا ڕووبەڕووی ئەم بەربەستە بنەرەتییانە دەبێتەوە:

أ- پێویستیی بەهێزکردنی دەسەڵاتی ڕاستەقینەی پەرلەمانەکان.

ب- چاککردنی لێهاتوویی دەسەڵاتی جێبەجێکردن وچاودێریی پەرلەمانیی بەسەریەوە.

ج- ناناوەندێتی دەسەڵات

د- پارێزگاریی قانوونیی بۆ تاکە کەس وبۆ کەرامەتی مرۆڤ.

و- هاوسەنگیی لە نێوان موداخەلەکردنی دەوڵەت و موداخەلەنەکردنی.

ز- یارمەتیی نێوان وڵاتان.

١١- لیبڕالیستەکان درکیان بەو هەقیقەتە هەیە کە دەڵێ دیموکراسیی ڕژێمێکی ئایدیالیست نیە بەڵکو ویژدانێکی زیاتری بۆ ئازادیی وکەرامەتی مرۆڤ و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی تێدایە.

١٢- لەو گریمانەوە کە هەموو ڕژێمێك شیانی هەموارکردنی هەیە، مانەوە لە حاڵی وەستاوییدا هەڕەشە لە سەقامگیریی و دوارۆژدەکا، ئەوا دەتوانرێ وەسفی دیموکراسیی لیبڕالیزم ئاوا بکرێ کە ڕژێمێکە توانای پتری هەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەربەستە هەمیشەییەکان بۆ چاککردن وچاکسازیی. ئەو دامەزراوانەی کە بە هۆیەوە بەهاکان تیایاندا بەرجەستە دەبن، ئەوانن کە دەگۆڕێن بەڵام خودی بەهاکان ناگۆڕێن.

١٣- چاککردن ونوێکردنەوە لە دامەزراوەکانی دەوڵەت وکۆمەڵگادا، لە کاتی ئێستادا بەلای لیبڕالیستەکانەوە پێویستییەکی گرنگە بۆ ئەمانەی خوارەوە:

**أ-** نوێنەرایەتییەکی چالاکانەتر بۆ ئارەزووەکانی گەل لە ڕێگەی دەسەڵاتی یاسادانانەوە، بۆ نموونە لە ڕێگەی نوێنەرایەتییەکی چالاکانەتر بۆ ئارەزووەکانی گەل لە ڕێگەی دەسەڵاتی یاسادانەوە، بۆ نموونە لە ڕێگەی نوێنەرایەتییەکی ڕێژەیی، ڕاپرسییەکان، گەشەپێدانی بەشدارییەکی ڕێك وپێك بە شێوەیەکی قانوونیی وڕاستەخۆ لە چالاکییە گشتییەکان وپاراستنی کەمینەکان لە پێناوی زامنکردنی یەکسانییە لە دەرفەتەکاندا.

**ب-** دووبارە ڕێکخستنەوەی دەستەی یاسادانان بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە زۆرێك لە توێژەکانی دانیشتووان بە تایبەتی لاوان، بە تەواوی لە کاری دیموکراسیی پەرلەمانەکان ڕازیی نین. لیبرالیستەکان بە نیگەرانیەکی گەورەوە دەبینین هێندێك لە دیموکراسییە پەرلەمانییەکان، چاودێریی چالاکانەی دەسەڵاتی جێبەجێکردن، لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە، بە هۆی حوکمی تەکنۆکرات و خەوشخاڵی دامەزراوەییەوە یاخود لە سەرینی هێندێك کۆمەڵی خاوەن بەرژەوەندی تایبەتەوە ڕووبەڕووی کۆسپگەلێك دەبێتەوە.

**ج-** دەبێ هەڵبژاردن لە بەینی دەسەڵاتی پەرلەمانیی یان دەسەڵاتی سەرۆکایەتی پشت ئەستوور بێ بە نەریتەکان وپێویستیی وڵاتەکان، لەگەڵ زامنکردنی چاودێریی (الرقابة) لەلایەن دەنگدەرانەوە لە ڕێگەی پەرلەمانەوە.

**د-** ناناوەندێتی دەسەڵات بە ڕوونیی لە ڕێگەی ڕێکخستنێکی ساغ و دیاریکراو بۆ حکومەتی هەرێمیی و ناوچەیی، چونکە لیبرالیستەکان ئەمە بە درێژبوونەوەیەکی ئاسۆیی گرنگ بۆ دابەشبوونی هەرەمیی و کلاسیکیی دەسەڵات دادەنێن.

**هـ-** زامنکردنی سەندیگاکانی بازرگانی و چالاکییە بازرگانییەکان ویەکێتییە پیشەییەکان لە ڕژێمی دیموکراسیی لیبرالیستی کە لەسەر بنەمای دیسپلین ولێپرسینەوە دامەزراوە لە پێناوی ڕەخساندنی هەل لە بەردەم نەخشە کێشان بۆ ئابوری بازار لەگەڵ هێنانە دی پەیوەندیگەلی پیشەسازیی تەندروست ودادپەروەرانەتر.

**و-** هەلومەرجی ئافرەت لە کۆمەڵگادا، سەرەڕای ئەو کۆسپانە کە بە سەریدا سەپاوە، لەو پرسانەیە کە گرنگییەکی بۆ هەمووان هەیە. هەلومەرجی نایەکسانیی



ئافرەت لەگەڵ پیاو دەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی بەهرەکانی نیوەی دانیشتووان، لە کاتێکدا گەشەپێدانی کۆمەڵگا پێویستیی بە بەشداریی هەموو هاوڵاتیان هەیە.

**ز-** پارێزگاریی قانوونیی بۆ تاکە کەس لە بەرامبەر هەموو کارو کردەوەیەك لە لایەن دەوڵەتەوە کە لەوانەیە هەڕەشە لە بوون و مافە بنەڕەتیەکان وەکو (ڕێگە نەدان بە ئەشکەنجە و بەتاڵ کردنەوەی کارکردن بە سزای لە سێدارەدان).

**ح-** پاراستنی تایبەتمەندییەکانی تاکە کەس لە بەرامبەر سیخوڕییکردن بە تەکنەلۆژیا و خراپ سوود وەرگرتن لە ئامێرەکانی کۆمپیوتەر لە لایەن دەوڵەتەوە یان دەزگا تایبەتەکانەوە.

**گ-** ڕێکخستنی توندو پتەو و چاودێریی لەسەر ئەندازەی بایۆلۆژی و یاریکردنی دەروونیی لە پێناوی پاراستنی تەندروستیی و کەسایەتیی تاکەکەس.

**ی-** هاوسەنگییەکی دانبەخۆداگرتووانە لە نێوان موداخەلەکردن و موداخەلە نەکردنی دەوڵەت لە پێناوی گونجاندنی بەرژەوەندی تاکەکەس و بەرژەوەندی کۆمەڵگا، لەمەشدا پرەنسیپەکانی لیبرالیزم بەمجۆرە خۆیدەنوێنێ.

* ئازادیی تاکە کەس لە پێشەوەی هەمووانەوەیە.
* دەبێ موداخەلەکردنی دەوڵەت لە پێناوی زامنکردنی ئازادیی بۆ هەمووان دابێت.
* بێ دەسپێشکەریی تاکەکەس و بەرپرسیاریی هەر کام لە هەردوو کەرتی گشتی وتایبەت، دەوڵەت خۆی دەکاتە ئامێرێکی بیرۆکراتیی بێ گیان وبەمەش بە خێرایەکی گەورە لێهاتوویی خۆی لە دەستدەدا.

**ك-** بەهێزکردنی ئەو ڕێکخراوانەی کە هەن و دروستکردنی ڕێکخراوگەلی نوێ لە سەر ئاستی نێودەوڵەتیی وکیشوەریی و جیهانیی لە پێناوی زیاتر کردنی ڕووبەری ئەو یارمەتییەی کە لە سەر بنەمای مامەڵەی یەکسان لە بەینی گشت دەوڵەتاندا دامەزراوە.

## چوارەم: کێشەکانی فێرکاریی و کولتووریی

١٤- لیبڕالیزمی نوێ ڕووبەرووی ئەمانە دەبێتەوە:

ا- فرە جۆریی کولتوورەکان لە سەر ئاستی جیهانیی

ب- لە لایەنی کولتوری و سیاسیی و پیشەیی و ئابووریی لە فێرکردنـی نوێـدا لـە نێو و لە پێناوی کۆمەڵگای دیموکراسیدا.

ج- پێوستیی ئازادیی و فرە جۆریی لە ڕاگەیاندندا.

١٥- ئەورۆ هۆشیاریی لە نێو دەوڵـەتانی ڕوولەگەشـە بـە ناسـنامەی کولتـووری خۆیەوە ڕوو لە زیادبوونە. تا ڕادەیەکیش کێشەوبەرەی قووڵ، بە تایبـەتیش لـە نێـوان ڕۆژئـاوا و جیهـانی ئیـسلامدا بەرهەمـدەهێنێ، ئەمـەش لـە ئـەنجامی خـراپ لـە یەکگەیشتنی هاوبەشە لە نێوان هەردوو کولتووردا. بۆیە ئەرك دەکەوێتە سـەر شـانی جیهانیی پیشەسازی کە درك بەوە بکات کـە بـە لای ژمارەیـەك لـە دەوڵەتەکانـەوە، ناکرێ بەهاکان و دەسکەوتەکانی شارستانێتی تەکنە لۆژیا، لەوە بە بەرزتر دابنرێ کـە ڕەخنەی لێبگیرێ یان سەرتاپا هەمووی ڕەتبکرێتەوە.

بە پێچەوانەی ڕژێمگەلی بەهاکانی دیکە کە لە ئەورووپا پەیدابوون، لیبڕالیزم، بە حـوکمی کولتوورەکەی، خاوەن هەڵوێستێکی لێکبووردن و کراوەیە لە بەردەم کولتـووره جیاجیاکانـدا. لە بەر ئەوە بێ سێوودوو دەبێ لیبڕالیستەکان پێگەی پێشەوە بگـرن لـە ڕیـزی ئەوانـەی کـە کورتهێنانی دیالۆگ لە بـەینی بـاکوور و باشـوور لـە سـەر کاروبـاری ئـابووری و سیاسـیی ڕەتدەکەنەوە. لە جیهانێکدا کە چەندین جەمسەری تێدایە، هەیمەنەی سەربازیی وئابووریی لە لایەن هێزە گەورەکانەوە مایەی گومـان و پرسـیارە، فـرە جـۆریی کولتـووریی بـە ئامرازێـك دادەنرێ کە بەهایەکی گەورەی لە بەهێز کردنی تێگەیشتن و یارمەتیداندا هەیە.

١٦- کولتـوور بـە لای لیبڕالیـستەکانەوە، بـە چـەمکێکی دامـاڵڕاو دانـانرێ، بـەڵکو کاریگەرییەکی ناڕاستەوخۆی لە سەر ژیانی هەر پیاو و ژن یان منداڵێکەوە هەیە لەمـەوە ئـەرکی ناوەندیی سیاسەتی کولتووریی لیبڕالیزم لە بەرزکردنەوەی هۆشیاریی خەڵك دا، لەوەی کـە بـوونی ئەوان بە توندوتۆڵیی پەیوەستە بە بەهاکان و کەلەپووری کەلتووریەوە خۆیدەنوێنێ.



ڕمێن دان بە چالاکییە کولتووریەکان لە ناوەوەی کۆمەڵگا و لە ڕێگەی خۆشـییەوە، بۆ خولقاندنی هۆشیاریی لە نێو گەورەترین ژمارەیەك لە هاوڵاتیان کە لە توانادایە، بە کولتووری خۆیان هەروەها تێگەیـشتنیان لـە کولتوورەکـانی گـەلان و کیـشوەرەکانی دیکە، ڕێگایەکی دیکە بوونی نیە.

١٧- ئامرازی بنچینەیی کە دەتوانرێ بە هۆیەوە ئەو کۆتوبەندانـە بـشکێنرێ کـە بەسـەر کولتـووردا سـەپێنراون، لەگـەڵ بەربـەرەکانیی نـاڵێکبووردەیی کولتـووریی و سیاسـیی و نـەژادیی لـە فێـر کردنـی ئـازاد، کـە لـە سـەر بنـەمای پرۆگرامـەکانی دیموکراسیی دامەزراوە، خۆیدەنوێنێ. فێر کردن، جاران و ئێستاش، گرنگترین ئـامرازە کە بە دەست سیاسەتی لیبڕالیزمەوەیە لە هەمبەر ڕمێندان بە ئاشتی و بەربـەرەکانیی لەمپەرە چینایەتیەکان و شێوەکانی زوڵمی کۆمەڵایەتی وئابووری، هەروەها لـە کـاتی هەوڵدان بۆ زاڵبوون بە سـەر دواکـەوتوویی وگەیـشتن بـە حاڵـەتێك لـە ئـاوێزانبوونی مەعریفە مرۆییەکان و تەکنیکدا. هەر بۆیە لیبڕالیستەکان داوا دەکەن کـە فێرکردنـی کوڕان وکچان لە هەموو تەمەنەکاندا پتەو بکرێ ئەمەش بە ئامانجی:

أ- خولقاندنی دەرفەتگەلێکی یەکسان بۆ هەر تاکێك لە بەدەستـهێنانی ژیـانێکی ڕەزامەند بۆ کەسایەتی خۆی و هەروەها سوود بەخشیش بۆ کۆمەڵگا،

ب- بەرزکردنەوەی هۆشیاریی خەڵك لە هەمبەر متمانە و پشتبەستنی هاوبەش لە بەینی دەوڵەتان و ناوچەکانی خۆیان بۆ گەیشتن بە ڕێگا چارە بۆ کێشە هاوبەشەکان کە بە زۆریی وا هەیە کە لە سەردەمی ئێستادا لە سنووری نەتەوەیی وڵاتاندا تێدەپەڕێ.

ج- زامنکردنی ئەوەی کە ئافرەت بڕی کەمتری پێنەبڕێ لە فێرکردندا بـە بـەراورد لەگەڵ پیاودا جا چ لە ساڵانی فێرکردندا بێ یاخوود ساڵانی دوای تەواو بوونی.

د- بەرزکردنەوەی هۆشیاریی باوکان لە مەڕ ئەوەی کە فێرکردنی باش لە ماڵەوەش هەر وەکو قوتابخانە،بناغـەی هاوڵاتیبوونێکی باش پێکدەهێنێ.

١٨-ئازادیی وفرە جـۆریی ئامرازەکـانی ڕاگەیانـدن پێداویـستییەکی کۆمـەڵگای لیبڕالیستییە، ئازادییە سیاسییەکان، تا ئەو کاتە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لە بندەسـتی

قۆرخکاران یان نیمچە قۆرخکاراندا بێ، دەرەتانی دابینکردنیان بۆ نابێ، جا ئەم قۆرخکارییە لە بندەستی دەوڵەتدا بێ یان لە بندەستی کەرتی تایبەتدا بێ. لیبڕالیستەکان بە نیگەرانییەوە لەو توندوتیژیانەوە دەڕوانن کە لە ناوەوەو دەرەوەی کۆمەڵگا لیبڕالیستەکانەوە دەکرێتە سەر ئازادیی ڕۆژنامەوانی، بەربەستە بنەرەتیەکانیش لەمانەدا خۆیان دەنوێنن:

أ- چڕکردنەوەی زۆر لە سەر موڵکداریێتی ڕۆژنامەکان لە نێو ڕژێمە دیموکراسییە پیشەسازییەکان.

ب- تەکنیکی نوێ ئاسانکاری لە پەیوەندیی بەردەوام لە بەینی دەوڵەتان زیاتر دەکا بەڵام کۆمەڵە ئامێرێکی مەترسیدار دەخاتە بەردەست کە دەکرێ بۆ دیاریکردن بە ڕای گشتی و لاواز کردنی کولتوورە ڕەسەنەکان سوودی لێوەربگیرێ.

ج- هێرشی حکوومەتەکان، گرووپگەلێکی خاوەنبەرژەوەند و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لە سەر ڕۆژنامەوانی فرە جۆر، کە لە دەرەوەی چاودێریی و دەسەڵاتی حکومەت.

لیبڕالیستەکان ئیقرار دەکەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم بەربەستانە کارەکە وا دەخوازێ کە پێویست بە پشتیوانیی دەوڵەت بکات لە ژێر سەرپەرشتیی ڕای گشتیدا لە پێناوی زامنکردنی بەردەوامیی فرە جۆریی ڕاگەیاندندا. ئەوان پێ لە سەر ئەوە دادەگرن کە ئەم پشتیوانیی و سەرپەرشتییە، هیچ گومانی تێدا نییە بە شێوەیەکی توندو تۆڵ چاودێریی بە سەرەوە بێ. ئەمان بۆیە ئەو کارە دەکەن تا ئەو پشتیوانییە بە دژی خۆیان هەڵنەگەڕێتەوە.

١٩- لیبڕالیستەکان ئیقرار دەکەن بەو داخوازییە ڕەوایەی دەوڵەتانی ڕوولەگەشە لە پێناوی بە دەستهێنانی نوێنەرایەتییەکی دادپەروەرانەتر لە نێو ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوادا.

ئەم داخوازییەش ناتوانرێ لە میانی چاودێریی و ئەو کۆتووبەندانە بێتە دی کە بە سەر هەڵڕژانی زانیارییەکاندا سەپێنراوە.

هەر بۆیە دەبێ ڕژێمە دیموکراسییە ڕۆژئاواییەکان و دەوڵەتانی ڕوولەگەشە بگەنە ڕێککەوتنێکی هاوبەش. کە لە بواری ڕێزگرتنی ئازادیی ڕۆژنامەوانیی فرەییدا قازانجی بۆ هەردوولا بگەڕێتەوە.



## پێنجەم: دۆزەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی

٢٠- لە کاتی ئێستاماندا ئەم کاروبارانەی خوارەوە ئەوپەری گرنگیان هەیە:

ا- ڕۆڵی ئابووری لە دیموکراسیی لیبڕالیزمدا.

ب- ڕۆڵی دەوڵەت لە گەشە پێدان لە ئابووری بازاری کۆمەڵایەتیدا.

ج- بیمەی کۆمەڵایەتی

د- تەکنیکی نوێ و پاراستنی ژینگە.

٢١- پرەنسیپی بنەرەتیی ئابووریی لیبڕالیستی

لەوەدا خویدەنوێنی کە لە کاتێکدا دەوڵەت بە زاڵبوونێکی تەواو بە سەر ئابووریدا زاڵدەبێت دەرەتان بۆ ئازادییە سیاسییەکان نامێنێتەوە و دەرەتانی دەستپێشکەرییە تایبەتیەکانیش تەمومژیان دەکەوێتە سەر. بەڵام بێگوێدانە ئەو خەیاڵەی کە هێندێك کەس پێچەوانەی ئەمەیان هەیە، ئازادیی ئابووریی ڕاستەقینە و هەمیشەیی بە بێ دابینبوونی ئازادیی سیاسی و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ، لە توانادا نییە دابین بکرێ.

٢٢-پەیوەندی نێوان ئابووریی بازاری کۆمەڵایەتی و دیموکراسیی لیبڕالیزم، بە لای لیبڕالیستەکانەوە ئاماژە دانە بە شەڕێکی بەردەوام دژی قۆرخکاریی و دەستە بەندییەکانی قۆرخخوازیی لە نێوان بەرهەمهێنەران و پراکتیزەی کۆتوبەندکراو و ئەو شتەی کە بە ناوی ((هەڵوێستە داسەپاوەکان))کراوە بێ یان داپۆشراو جا ئەمەیان بە ئاوارتەی (استثناء) ئەو حاڵەتانەی کە قانوون ئیقراری پێدەکاو کۆمەڵە پێداویستییەکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتیش پاساوی دەداتەوە.

٢٣- لە سەر ئاستی نێو دەوڵەتیش ئەمە کارێکی سرووشتییە کە ئابووریی بازاری کۆمەڵایەتی وێڕای خۆی بازرگانیی ئازاد، کە لەسەر بنەمای یەکسانیی و هاوبەشیی دامەزراوە، لە هێندیك حاڵەتیشدا نەخشە کێشان بۆ بازاریی نێودەوڵەتیی، لەگەڵیدا بێت. بەڵام پارێزگاریی (الحماية)، چ لە سەر ئاستی تیۆری بێت یان لە سەر ئاستی کرداریی بێ، لەگەڵ ئابووری بازاریدا یەکتری ڕەتدەکەنەوە.

٢٤- سەقامگیرکردنی رژێمە لیبڕالیستە دیموکراسییەکان و کارکردنی راست بۆ ئابووریی بازاریی کۆمەڵایەتیی، رووبەرووی مەترسیی دەبێتەوە لە کاتێکدا کۆمەڵە کەرتێکی گەورە لە دانیشتووانی ولآت لە حاڵەتێکی هەژاریدا دەژین. بۆیە وا پێویست دەبێ کە حوکمی مەدای سەرکەوتنی کاری ئابووریی بازاڕ لە میانی ئەو تاقەتەوە بدرێ کە لە زامنکردنی تێراییکردنی سامانی مادی و دابەشکردنی بە دادپەروەریی هەروەها لە سەر هێزی ئابووریی هەیەتی نەك لە سەر هیچ سیستەمێکی تر.

٢٥- لە مەودایەکی درێژخایەندا، دەکرێ لە گوڕوتینی هەژاریی، لە زۆر ناوچەی جیهاندا، لە میانی ئازادیی بازرگانییەوە کەمبکرێتەوە، بەلآم نموونەی ئەمجۆرە ئازادییە لەلایەن دەستە بەندییەکانی قۆرخکاریی لە نێوان بەرهەمهێنەران و یەکێتییەکانی قۆرخکاریی دەکەوێتە بەر هەرەشەوە، ئەمە سەرەڕای نرخدانانی دەستکرد و نا دادپەروەرانەی کەرەسەی خاو و بەربوومی کشتوکاڵیی، کاتێکیش ئابووریی بازار لەگەڵ پارێزگاریی (الحماية) لەسەر ئاستیی تیۆریی یان کرداریی رووبەرووی دەبێ، دەکرێ مشتوومڕ لە بارەی دانانی رێوشوێن و کارسازیی خۆپاراستن (وقائية) بکرێ بەو سیفەتەی ئامرازێکە ئامانجی دووبارە گێڕانەوەی ئازادیی بازرگانییە بەلآم بە ئاوارتەی کارسازیی تایبەت بۆ دەوڵەتە هەژارەکان.

٢٦- ئەو قۆرخکارییانەی کە هی دەوڵەت یاخوود کەرتی تایبەتن، ئەوانەی کە لە سەر ئاستی نەتەوەیی یان نێودەوڵەتیی کاردەکەن، هەرەشە لە ئابووری بازار دەکەن و ئەمە وا پێویست دەکا بۆ یاسادانانێکی توندوپتەو ملکەچ بۆ بکرێ. لەمەدا لیبڕالیستەکان قەبالەنامەگەلێك لە ئاکار بە پەسەندتر دەزانن، بەڵکو لە کاتی پێویستیدا لە هەمبەر کۆمپانیاکانی سنوورپەڕێندا، بوونی یاسادانان بە پەسەندتر دەزانن.

هەروەها لیبڕالیستەکان ئیقرار بە مەودای مەترسیداری ئەو کۆمپانیایانە دەکەن لە رووی خراپ بەکارهێنانی دەسەلآتی ئابووریی و سیاسیی لە لایەکەوە و، شوێنەواری ئەرێنی لە سەر بلاوکردنەوەی وەبەرهێنان و تەکنیکاریی و هەروەها فرەجۆری کردنی چالاکیی.



٢٧- چەمکی لیبڕالیستی بۆ بازاڕ، بە جۆرێکی هەڵە پەیوەست بووە بەو ئابوورییەی کە تەنیا ملکەچی بالآدەستیی دراو (پارە) یان ئابووریی (دەستێوەرنەدان)ـە- عدم التدخل (Laisser- faire)

کە لەگەڵ بەرژەوندییەکانی هەژاران و کۆمەڵگا بە گشتی، لێکترازاوە. لیبڕالیستەکان ئەم لێروانینە گەمژەیە بۆ ئابووری بازاڕ و هەڵوێستی ئەوان لە هەمبەریدا قبوڵ ناکەن. ئەوان زەمەنێکە ئیقرار بەوە کردووە کە ئازادیی ئابووریی لە حاڵێکدا کە لەگەڵ خۆشگوزەرانیی و بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگادا یەکناگرێتەوە، دادەبەزێت بۆ ئاستی پشێویی و بێسەروبەری و دەبێتە یەکێك لە ئامرازەکانی سەرکووتکاریی.

٢٨- نەخشەکێشان بە واتای لیبڕالیستیی وشەکە، بریتییە لە پلاندانان بۆ ئازادیی و پلانێك لە پێناویدا. پلاندانان لە ئابووریی بازاری کۆمەڵایەتیدا پشت بەو کارلێکەی نێوان دەسپێشکەرییە تایبەتیەکان و موداخەلەکردنی دەوڵەت دەبەستێ کاتێکیش کاروبار وا بخوازێ دەکرێ کە سیاسەتی موداخەلەیەکی نەرم، ببێتە پاژێك لەو پلاندانانە. لەکۆمەڵگای نوێدا گیروگرفتە ئابوورییەکان لەوە زیاتر ئاڵۆز بوون کە بتوانرێ بە تەنیا لە میانی کەرتی تایبەتەوە، یاخود بە تەنیا لە رێگەی کەرتی گشتییەوە کۆنترۆل بکرێ.

٢٩- ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە بەرهەمهێنان و خزمەتگوزارییدا دەکرێن و بە بەرهەمی حەتمی پێشکەوتنی تەکنیکی دادەنرێن، کۆمەڵە کێشەیەك دەخوڵقێنن کە کۆششگەلێکی بێبڕانەوەیان لەلایەن دامەزراوە تایبەتەکان و دەوڵەتەوە پێویست دەبێ. لە بەر ئەوە وا پێویست دەکا کە موداخەلەی کەرتی گشتی بە ئامانجێك بێ کە دامەزراوەی کێبەرکێکارانە لە ژێر چەتری بازاردا بخوڵقێنی. ئێمەی لیبڕالیست متمانەی خۆمان بەوە تەئکید دەکەینەوە کە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان کە لە ئاکامی بلاوبوونەوە و پیادەکردنی تەکنیکی نوێوە سەریهەڵداوە، لە کاتێکدا لە ژێر سێبەری گیانێکی هاوکاریی مرۆڤدۆستانەی ئاشتیدا و، لە چوار چێوەی دەوڵەت و

کۆمەڵگایەکی لیبڕالیستیی دیموکراسیدا و بە تایبەتی لە کەرتەکانی زانیاریدا، روودەدا، دەتوانێ ببێتە هۆی بەشداربوونێکی بەرفراوانتری ئەقڵی مرۆیی لە کرداری بەرهەمهێنان، هەلومەرجی زیاتر بۆ کاری مرۆڤ و لە کۆتایشدا دەبێتە هۆی رزگار کردنی سەرچاوە سرووشتییەکان بەو پێوەدانگەی ئامرازێکە بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی مرۆڤ.

٣٠- لەم روانگە نائایدۆلۆجییەوە بۆ رۆڵی دەوڵەت لە ئابووری، لیبڕالیستیەکان، پەیوەندییەك لە بەینی هەردوو کەرتی گشتی وتایبەت لە هەر ئابوورییەکدا و لە هەر زەمەنێکدا وا نابینن کە پەیوەندییەکی جێگیرە یاخود بە سەر چووە. لە کاتێکدا کە دەرەتانی ئەوە هەیە کە دەوڵەت یان دەسەلاتە ناوچەییەکان، بە هۆی پابەندییان بە بەرژەوەندی کۆمەڵگا، ناچار بکرێن تا سەرپەرشتیی کاری چالاکیی ئابووری بکەن، ئەوا هیچ سێوودووی تێدا نیە کە دەبێ پێداچوونەوەی بەردەوام بۆکاری گشتی بکرێت بۆ ئەوەی بریاردان لەبارەی هەرکام لەو چالاکاییانە, دەبێ بێ سێودوو بگەڕێنرێتەوە بۆ کەرتی تایبەت یان رێکخراوە خۆبەخشەکان، کە لەلایەن کۆمەڵێك لە هاوڵاتییان, کە هاوکاریی لایەنە حکومییەکان دەکەن, سەرپەرشتی دەکرێن,بەڵام پێویستە کە ئەم قۆرخکارییە گشتیانە نەگۆرین بۆ قۆرخکاریی لەسەر ئاستی کەرتی تایبەت.

٣١- لیبڕالیستەکان ئەو رژێمە دیموکراسییانە بە پەسەندتر دەزانن کە لەسەر بنەمای پیشەسازیی دامەزراون و پشتبەستوون بە بەشداری راستەخۆو راستەقینەی کارگەران و دابەشکردنی قازانجەکان. ئەم رژێمانە لەواری کرداریدا شایستەیی خۆیان سەلماندووە و گومانی تێیدانیە کە دەبێ کاربۆ پەرەپێدان و گەشەپێدانیان بکرێ. شێوەکانی رێکخستنیش لە هەردوو کەرتی گشتی و تایبەت لە مۆدێلە نوێکاندا، ئاوارتە ناکرێن.

لیبڕالیستەکان هانی کۆمەڵە هەرەوەزییەکان و ئەو کۆمپانیایانە دەدەن کە موڵکی ئەو کەسانەیە کە کاری تێدادەکەن و هەروەها هانی ناناوەندێیتی پرۆژە گەورەکان دەدەن لەرێگەی دابەشکردنیان بۆ یەکەی بچوکتر.



٣٢- کارسپێریی هێزی کارگەر، بەلای لیبڕالیستەکانەوە، بە ئاواتێکی گەوهەریی ئابووریی و کۆمەڵایەتی دادەنرێ, بێکاریش لەئاستی فراواندا بە تایبەتیش لە نێو لاواندا، بە لای لیبڕالیستەکانەوە بە کارێکی قبوڵنەکراو دادەنرێ. لەو ناوچانەشدا کە دیاردەی بێکاریی لەگەڵ نەبوونی دەرفەتەکانی کار تێیاندا بڵاو بۆتەوە, وێرای نەبوونی ئەگەرەکانی لەسەر کار دامەزراندن.

کە دیاردەی بێکاریی لەگەڵ نەبوونی دەرفەتەکانی کار تێیاندا بڵاو بۆتەوە، وێرای نەبوونی ئەگەرەکانی لە سەر کار دامەزراندن، ئەوا بەها بنەرەتییەکانی سیاسیی و ئابووریی لیبڕالیستیی دەکەونە بەر هەرەشەیەکی گەورەوە.

٣٣- ئابووریی بازار، لە کاتێکدا کە رێگەیان هانی گەشەی ئابووریی دەدا بێئەوەی رەچاوی کاریگەرییەکانی لە سەر ژینگە بکا، بناغەی خۆی هەڵدەتەکێنێ. چونکە گەشەی چەندایەتی ئابووریی، لە بەرژەوەندیی کۆمەڵگا دەترازێ و بە هەموو مانای وشەکەش پەیوەستە بە چۆنایەتیی ژیان. پەیکەرەکانی ئابووریی بازاڕ و پاراستنی ژینگە تەواوکەری یەکترین. کاتێك سەرچاوە سرووشتیەکان وسرووشت ئەنگر (الدمار) دەبن، هیچ شتێك نامێنێتەوە کە رێگا بە ئابووریی بدات کار بکا. هەر بۆیە لە سەر پلاندانان و هەروەها رەسمەکانی باجگیریش پێویستە کە ئەمە بە چاوی بایەخپێدانەوە وەربگرن لە لایەکی دیکەوە، تیۆریی ((وەستانی گەشە -zero- growth)) بە چارەسەری دەردە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکان دانانرێ، هەر نەبێ لە بەر ئەوەی گەشەپێدانی هاوسەنگ کە هەوڵی هێنانە دی بۆ دەدەین، تیبێچوونەکانی روو بە زیادییە.

٣٤- تاکەکان بەو سیفەتە کە هاولاتیگەلێکی ئازادن، سەرەتاو کۆتایی هەر خۆیان هەڵگری بەرپرسیارێتیی بوون و پەرەسەندنی خۆیانن لە مەدای ژیانی خۆیاندا. بەڵام لە بەر کۆمەڵە هۆکارێك کە لە سەرووی دەسەڵاتی ئەوانە وەکو نەخۆشیی و کەمئەندامیی وبێکاریی و پیریی، لەوانەیە نەتوانن ئەو بەرپرسیارێتییە هەڵبگرن، لەم حاڵەتدا ئەو کۆمەڵگایەی کە دەوڵەت رێکدەخات لە هەمبەر دابینکردنی کۆمەڵایەتی و خۆشگوزەرانیی مادییدا، بەرپرسیار دەبێ.

٣٥- نابێ ڕۆڵی بڕیاردەریی دەوڵەت هەمووان وا لێبکا کە پشت بە کۆمەکی دەوڵەت ببەستن. ئەو مەترسییە بنەڕەتییانەی کە بەرنامەی خۆشگوزەرانیی تێیدا پشت بە دەوڵەت دەبەستێ لە مانەی خوارەوەدا خۆی دەنوێنێ:

أ- وا لە خەڵك دەکا کە پشت بە حکوومەت وبیروکراتیی ببەستن، بە ڕەنگێك ئەمە وا دەکا کە هەستکردن بە لێپرسراوێتی وئازادییان سنووردار بکا.

ب- ڕژێمێکی بیروکراتیی بەرفراوان دەخولقێنێ کە چنگ لە دەسەلات بە ڕادەیەك گیر بکا کە لە سەرووی توانای خۆیەوە بێ.

ج- کەمبوونەوەی بڕێکی گەورە لە داهاتی نەتەوەیی و ئاراستە کردنی بۆ ئەو پێداویستیانەی کە بایەخ بە وەبەرهێنان (استثمار) دەدەدن لە کرداری بەرهەمهێنان و توێژینەوەو گەشەپێداندا.

د- لەوانەیە ئەمە ببێتە هۆی هەڵئاوسان ولە سەرینی ئەمەشەوە بەگەر خستن و وەبەرهێنان دژوارتر بکا.

٣٦- لیبڕالیستەکان باوەڕیان وایە کە پێویستە سەپاندنی باجەکان بە جۆرێك بێ کە لەگەڵ مافەکانی تاکەکەس و پێداویستییەکانی کۆمەڵگا بۆ کاری پاشەکەوت و وەبەرهێنان گونجاو بێ، هەر بۆیە پێویستە سەپاندنی باج، دەبێ بێ سێوودوو ئەو ڕۆڵە ئەرێنییە لە هاندانی چالاکیی بازرگانیی وزامنکردنی بڕێکی گەورە لە ڕەخساندنی دەرفەتەکاندا بگێڕێ.

لیبڕالیستە کان بانگەوازی پرەنسیپی سوودو سوودوەرگرتن دەکەن. بۆیە لەسەر دامەزراوەکان وبەکارهێنەرانیش پێویستە نرخی ئەو کالاو خزمەتگوزارییانە بدەن کە لە حکوومەت دەستیان دەکەوێ، نەك دانانی تێچوونە کان لەسەر حیسابی ژمارەیەك لەوانە کە باج دەدەنە حکوومەت ئەمە لە کاتێکدا کە شیانی جێبە جێکردنی هەیەو دادپەروەریی تێدایە. ئەمەش سنوورێك بۆ فەوتاندن دادەنێ هەروەکو هاوسەنگیی نێوان داخوازیی و خستنە ڕوو لە کەرتی گشتیدا پتەو دەکا.

٣٧- لە کاتی هەوڵدان بۆ لە نێو بردنی هەژاریی و زوڵمی کۆمەڵایەتی، ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێ کە مەزهەبی ((یەکسانیگەریی)) قبووڵ دەکرێ. بەڵکو بە واتای



مافێکی بێپەردە لە یەکسانیی تووندو تۆڵ لە نێوان هەلومەرجی هەمووواندا بێ ڕەچاو کردنی بەهرە یان کار یان بیرکردنەوە. سەرەرای ئەوەش کە لیبڕالیستەکان پشتیوانیی لەو کارسازییە دەکەن کە ئامانجی ئەوەیە سنوور بۆ جیاوازییەکان لە ساماندارییی و پاراستنی هاولاتی و زیاتر یەکسانکردنی دەرفەتەکان دابنێ، بەلام بە بەرهەڵستیەکی بنبڕانەوە، بەرهەڵستیی مەزهەبی ((یەکسانیگەریی)) دەکەن کە بایەخی تاکە کەس هەڵدەتەکێنێ، لە کاتێکدا ئیقرار کردن بە بالادەستی تاکە لە ژێر سێبەری دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بەکارێکی پەسندو شیاو بۆ هاندان دادەنێن.

٣٨-لیبڕالیستەکان وایدادەنێن کە هەر مرۆڤێك بێهاوتایە و یەکسان نیە بە کەسانیتر، بەڵکو نرخی هەر مرۆڤێك یەکسانە بە نرخی ئەوانیتر. یەکسانیی واتە پێویستە هەمووان وەك یەك دەرفەتی یەکسانیان دەستبکەوێ لە پێناوی گەشەپێدانی خود و هەروەها پێویستە ئەو دەرفەتگەلەشیان بەردەست بکەوێ تاکو بەشدارییەکی تەواو پێشکەش بە کۆمەڵگا بکەن.

## شەشەم: لیبڕالیزم وکاروباری نێودەوڵەتیی

٣٩- لە نێو ئەو کێشە زۆروزەوەندانەی کە لیبڕالیستەکان ڕووبەڕووی دەبنەوە، ئەمانەن کە بە مانای خوارەوە پەیوەستن:

* مافەکانی مرۆڤ ومافە سیاسییەکان ((سیاسەتی واقیعییانە)).
* گرژیی وتەبایی نێوان ڕۆژهەلات ورۆژئاوا.
* دوو جەمسەریی وفرە جۆریی.
* پێشبڕکێی پرچەکبوون.
* ڕێکخراوە هەرێمییەکان.
* دەوڵەتانی بێلایەن.
* دەوڵەتانی رووڵەگەشە.
* نەتەوە یەکگرتووەکان.

٤٠- لیبڕالیستەکان رووبەرووی ئەم بەربەستانە دەبنەوە، وەکو دیالۆگی نێوان باکوورو باشوور بە روحێکی جیهانیی گەردوونیی. رەتکردنەوەی کلاسیکیانەی ئەوان لە بەرامبەر قبوولکردنی رەگەز یان نەژاد یان باوەڕ یان چینایەتی یان نەتەوایەتی یان تەمەن وەکو هۆکارێك بۆ جیا خوازیی، لیبڕالیستەکان لە کاتی ئێستادا لە سەر کاروباری جیهاندا لەودیو سنووری دەوڵەتە پیشەسازییەکانەوە جێبەجێی دەکەن. ئەم هەڵوێستەش لەو گروڤاندنە[4] روونکراوەیەی کە دەوڵەتان لە نێوان یەکتریدا بە شێوەیەکی روو بە زیادە پشتی پێ دەبەستن، بەڵکو لەو ئیقرار کردن بەوەی کە فرە جۆریی کولتوورەکان پێویستییەکە کە بواری خۆلادانی تێدا بەدیناکرێ، ئەگەر نا بیروکراتیی وشانازیکردن بە نەتەوایەتی وەحشەتی دەهێنایە ئاراوە، تەکنیك و روحی بەکار بردن بە شێوەیەك ریشەی قووڵ دەبۆوە کە لایەنی مرۆڤایەتیی لای هەر ژن و پیاوێك دەخنکاند، ئەمەش ئەم لایەنەیە کە ئێمە ئەوپەڕی گرنگیی، گرنگیی پێدەدەین.

هەروەها ئەم هەڵویستە لە وێرا سەرچاوە دەگرێ کە هۆشیاریی لە بارەی متوربە بوونی شارستانێتی لە بەینی کولتوورەکان لە گشت گۆشەیەکی جیهاندا، شارستانێتییەکی فرە جۆریی دەخولقێنی کە بەشداری لە تێکگەیشتنی گشتی و رێگا چارەی ئاشتیی کێشەوبەرەی حەتمی بەینی بەرژەوەندەکاندا دەکا.

٤١- مافە شارستانیی و سیاسییەکانی مرۆڤ، دیارییەکە بۆ هەر ژن و پیاوێکی سەر رووی زەوی کە قابیلی دەستکاریی کردن نییە. هەر بۆیە داکۆکیی لەم مافانە و رمێن دان پێیان لە ئەرکە پێویستیەکانی دەوڵەت یان کۆمەڵێك لەو دەوڵەتانەیە کە ئەم مافانەی تێدا پیادە دەکرێ تەنانەت ئەگەر بە کۆمەڵێك کۆتوبەندیشەوە بێ. لەوانەشە ئەمە ببێتە هۆی نانەوەی کێشەوبەرە لە نێوان ئەو دەوڵەتانەی کە بەرژەوەندییان بۆ مەودایەکی کورتخایەنە. بەڵام بێ رەچاو کردن پێویستە حکوومەتەکان هەڵسوکەوتی هەرە گونجاو پیادە بکەن بۆ هێنانە دی قبولکردنی مافە

4- برهان



شارستانیی ومافە سیاسییەکانی مرۆڤ، هەروەکو لیبڕالیستەکانیش رەتکردنەوەی راشکاوانەی ئەم خراپەکارییە، وەکو ئەرکێك دەخەنە سەر شانی خۆیان بە زۆریش وایە کە لە مەودای درێژ خایەندا، ئەم سیاسەتانە سەرکەوتنی گەورە بە دەستدەهێنن، بە تایبەتی لە جیهانێکدا کە رای گشتی رۆڵێکی زیاتری تێدا دەگێرێ. ئەم کارە بە شێوەیەکی تایبەتی لە دەوڵەتانی ئەمریکای لاتین و ئەفریقادا بەڕێوە دەچێ.

٤٢- هەر لە ساڵی ١٩٤٥ وە جیهان ملکەچی بارگرژییەکی بەردەوامی نێوان پەیمانی باکووری ئەتلەنتیك و دەوڵەتانی پەیمانی وارشۆ، ئەو بارگرژییەی لە مەڕ پەیوەندیی نێوان ولاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤێتدا بوو، بارگرژییەکەش کێشەی نێوان باوەڕەکانی رۆژئاوا،کە ملکەچی دامەزراوە دیموکراسیەکانە، لەگەڵ رژێمی توتالیتاری فەرمانرەوا لە یەکێتی سۆڤێتییە. ئەوەی کە ئەم بارگرژییەش زیاتر پتەو دەکا، وابەستەیی زۆریی دەوڵەتانی بچووك بە پەیمانی وارشۆ بۆ سیستەمی فەرمانرەوایی و سیاسەتەکانی گوێ لە مستی ژێر رکێفی یەکێتی سۆڤێتییە. هەردوو لاش ئیقراریان بەوە کردووە کە ئەگەری ئەوە هەیە مەترسیی ئەم بارگرژییانە بە بنبەست بگاو بتەقێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە جەنگێکی جیهانیی یان کۆمەڵە جەنگێکی سنووورداری مەترسیدار، هەروەکو ساڵ لە دوای ساڵ بینیمان. سیاسەتی تەبایی شوێنی گرت، واتە دان وسەندن و یەککەوتنی زۆر، کە ئەمەش بووە هۆی رێککەوتنی هلسنکی، بەڵام ئەم دەسکەوتانە ئێستا کەوتوونەتە بەر هەڕەشەوە.

- لەو فاکتەرە گرنگانەش کە بارودۆخەکە پتر بەرەو ئاڵۆزی و گرژیی زۆر دەبا لە هێزی سەربازیدا لەلایەن رۆژهەڵات و رۆژئاواوە، ئەوەیە کە یەکێتیی سۆڤێت تا ئێستا توانیویەتی هاوسەنگییەکی جیهانیی لە بەرامبەر ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، لە چەکی ستراتیژیی ئەتۆمی بهێنێتەدی.

لە ئاستی ئەوروپاشدا، لەباری هێزگەلی ئەتۆمیی درێژخایەن و چەکی کلاسیکییەوە، پەیمانی وارشۆ، بەسەر پەیمانی باکوری ئەتلانتیکدا بالادەستی هەیە.

له سێبەری ئەم هەلومەرجەدا، لیبرالیستەکان باوەڕیان وایە:

أ- گیانی لیبرالیستیی جیهانی، وای دەسەپێنێ کە هەلۆیستەکانی رۆژئاوا بەرامبەر بە یەکێتی سۆڤیەت، پڕاوپڕ لەو متمانەیە بێت کە لە هێزی شاراوەی بیر و دامەزراوە ئازادیخوازەکاندا هەیە.

ب- پێویستە لە سەر رۆژئاوا کە لە هەموو زەمەنێکدا دۆزی مافە شارستانی ومافە سیاسییەکان لە بەردەم گشت دەولەتانی جیهان لە ئامێز بگرێ، ئەمەش بە پێی پێناسەکردنی بۆ بەلگەنامەکانی کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە بارەی مافەکانی مرۆڤەوە دایڕشتووە و هەروەها بە پێی ئەو شێوەیە کە لە ((جارنامەی کۆتایی هلسنکی)) ((final act of Helsinki)) دا هاتووە، ئەمانە ئەم بەلگەنامانەن کە ئیمزای هەر کام لە رۆژهەلات ورۆژئاوایان لە سەرە.

ج- پێویستە هاوکاریی کولتووریی و تەکنیکی وئابووری نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا بەو سیفەتە سەیر بکرێ کە پاژێکە لە پەیوەندی سەرتاپایی نێوان هەردووکیان.

د- دەبێ بێ سێوودوو دیالۆگ و دانوساندن بەردەوام بێ، لەگەل پێداگریی لە سەر ئەو زمانی زاراوەیە کە بانگەوازی چەك داماڵین و کۆتاییهێنان بە کاروباری دەستێوەردانی سەربازیی و پێشبڕکێی پڕ چەکبوون دەکا. .

ه- کرانەوەی سیاسیی (detente)گشتێکەو پارە پارە ناکرێ.

و- رۆژئاوا لە هیچ کاتێك لە کاتەکاندا نابێ واز لەوە بهێنێ کە یەکێتی سۆڤێت بکەوێتە بن باری خەیالێکەوە، لەوەی کەپەیوەست دەبێ بە ئارەزووی خۆی لە دانوسەندنداو لە رووبەرووبوونەوەی دەستدرێژی.

ز- هاوسەنگیی هێزی سەربازیی، لەوەی کە بە بەردەوامبوون و سەرکەوتنی کرانەوەی سیاسییەوە پەیوەستە، تەنانەت ئەگەر سنووردارێش بێ، مەرجێکە دەستبەرداربوونی بۆ نییە.

٤٣- ئەم لێك جیاییەی نێوان چین و یەکێتی سۆڤێت، سەرەرای دەرکەوتنی هێز گەلێکی نوێ (وەکو رێکخراوی دەولەتانی هەناردە کردنی پترۆل- ئۆپێك) لەو



کاریگەرییە روو لە پەرەسەندنەی لە سەر رووداوەکانی جیهان هەیەتی، رێگەی بۆ لە دایك بوونی بیرۆکەیەك ئاوەلا کردووە ئەوە ئاشکرا دەکا کە پەیوەندی دوو جەمسەریی نێوان دەولەتانی پەیمانی وارشۆ، ئێستاکە جیهانێکی فرە جەمسەریی دەخوازێ، بەمجۆرە دەولەتانی پەیمانی باکووری و لیبرالیستەکان وایدەبینن کە:

أ- بەهۆی پالنەرەکانی هێزی سیاسیی و سەربازیی و ئابووریی، پەیوەندییەکانی ((دووجەمسەریی))گرنگییەکی مەزنی هەیە و بۆ ماوەیەکی درێژی داهاتووش ئاوا دەمێنێتەوە.

ب- وەرسوڕان بە ئاراستەی (فرە جەمسەریی) ناتوانرێ نکوولیی لێبکرێ، ئەمەش ئەم کارەیە کە تێڕوانینی گەردوونیی جیهانیی لای لیبرالیستەکان بکاتە کارێکی خاوەنبایەخ.

ج- رۆلی دەولەتانی بێلایەن و کەنارگیر لە سیاسەتی جیهانیدا گرنگییەکی زیاتر وەردەگرێ بگرەئەم دەولەتانە دەرەتانی هەیە ببنە هێزگەلێکی میانگیر.

د- گرنگیدانی گەورە و بێ سێوودوو دەبێ بۆ دامەزراندنی هاوکاریی ئاشتیی لەگەل هێزە دەرکەوتووە نوێیەکان تەرخان بکرێ.

٤٤- لە نێو ئەو هێزانەشدا بێگومان دەبێ ئەو کۆمەلە و کۆمکارییە هەرێمییانەی کە لە ژمارەیەك دەولەت پێکهاتوون، واتە ئەو کۆمەلانەی کە لە شوێنە جیاجیاکانی جیهان بەدەردەکەون، زامنبکرێن. لە هەمووشیان گرنگتر بازاری هاوبەشی ئەورووپایە کە لە پال دەسکەوتە ئابوورییەکانی، درێژبوونەوەیەکی لە دامەزراوە سیاسییە دیموکراسییەکان بۆ نێو پەیوەندییە نێو دەولەتییەکان هێناوەتە دی. ئەمەش ئەو کارەیە کە بە دەوری خۆی دەبێتە هۆکاری خولقاندنی فاکتەرێکی نوێ لە هاوسەنگیی نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا و جیهان بە شێوەیەکی گشتی. هەروەها لە ریزی رێککەوتنە فرە رەگەز و رێکخراوگەلی نوێی دیکە، پەیمانی ئەندی، هاوبەندیی دەولەتانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا (ئاسیان)، یەکێتی ئەورووپا بۆ بازرگانیی ئازاد (ئیفتا)، رێککەوتنی لومیە، رێکخراوی یەکێتی ئەفریقا، ئەمانە ئەو کۆمەلە کۆمکارییەن کە سەرەرای ئەوەی کاریگەرییان هەروەکو کاریگەریی بازاری هاوبەشی

ئەورووپا نییە، بەڵام هێشتا ئامرازگەلێکی بەنرخن بۆ زامنکردنی سەقامگیریی هەرێمیی وئابووری وسیاسیی. لیبرالیستەکان بەمە خۆشحاڵن و پشتگیریش لەم پەرەسەندنانە دەکەن کە هاوتەریبی گۆشە نیگای ئەوانە لەبارەی ئەوەی کە پەیوەستە بە تێگەیشتنێکی نێودەوڵەتیی باشتر لە سەر بنەمای کولتوورگەلی هاوبەش وبەرژەوەندی هاوبەش.

٤٥- بەڵام لە بارەی دەوڵەتانی بێلایەن: ئەوا لیبرالیستەکان وایدەبینن کە:

أ- گومان لەوەدا نییە کە دەبێ هانی ئەو کۆششانە بدرێ کە هەوڵدەدا رووبەرێکی گەورەی جیاواز بخولقێنێ وپارێزگاریشی لێبکا لەوەی کە لایەنگیریی لە هیچ هێزێك لە دوو هێزە گەورەکە ناکا.

ب- هەر دەوڵەتێك مافی ئەوەی هەیە کە لایەنگیریی لە هیچ کام لەو دوولایە نەکا.

ج- ژمارەیەك لە دەوڵەتانی بێلایەن دەتوانن بە رادەیەکی گەورە بەشداریی لە بڵاوکردنەوە و قبولّ کردنی پرەنسیپی لیبرالیستیی جیهانیی گەردوونیی بکەن.

٤٦- ئاستی ئێستاو رووبە زیادی خەرجکردن لە کاری خۆپرچەککردن بە مەترسییەکی تۆقینەر دادەنرێ. ئەم بارەش رۆژ بە رۆژ گرانتر دەبێ وەهەروەکو دەوڵەتانیش هاندەدا لە سەر بەردەمبوون لە سەر ئەوەی کە بە جەنگە ((سنووردارەکان)) ناودەبرێ ئەم پێشبرکێی خۆ پر چەککردنە،تەنانەت لە بەینی دەوڵەتە هەژارەکان وبگرە هەژارترین دەوڵەتانی رووڵەگەشە بڵاوبۆتەوە بە رەنگێك کە بارگرانییەکی تۆقێنەری بۆ سەرشانیان پێکهێناوە:

أ- نابێ دەست لە تێکۆشانی بێوچان هەڵبگیرێ لە پێناو راکێشانی ئەم خەرجکردنە لە چاکسازیی بۆ ژێر دەسەلاتی چاودێری ((الرقابة)) لەگەڵ دانانی سنوورێکی رێژەیی لە رێگای کۆششکردنێکی هاوسەنگەوە. ئەم ئامانجەش کە جاران ئامانجێکی ئایدیالیست بوو ئێستا بۆتە یەکێك لە پرسەکانی ژیان یان مردن.

ب- بێ سێوودوو دەبێ پیشەسازیی وگواستنەوە و بازرگانیی چەك ملکەچی چاودێرییەکی توندوتۆڵ بێت لە لایەن حکوومەتەکانەوە بە پێ ی رێکەوتنەکانی



نێوانیان. بۆ ئەم مەرامەش بێگومان دەبێ تۆمارێکی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان دابمەزرێ تاکو گواستنەوەی هەموو چەکێك لە رێگای سنوورەکانەوە لەوێدا تۆمار بکرێ.

ج- ئاڵۆز بوونی رووبە زیادیی ئەم چەکانە دەبێتە هۆی ئەوە کە کارەکە نەك هەر تەنیا بۆ ئەرکێك، بەڵکو بگۆرێ بۆ کاری فریاگوزاری دەسبەجێ.

٤٧ -لیبرالیستەکان تەئکید لەو رایەی خۆیان دەکەنەوە کە لە میانی جارنامەی ئۆکسفۆرد لە ساڵی ١٩٦٧ لە بارەی نەتەوە یەکگرتووەکان رایانگەیاندووە. لیبرالیستەکان لەو باوەرەدان نەتەوە یەکگرتوەکان، کە لە بنچینەدا بۆ پووچەڵ کردنەوەی ناکۆکیی و کێشەکان و پیادەکردنی سەروەریی قانوون بە سەر پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکانەوە دامەزراوە، شایانی پشتگیریی گەلانە لە هەموو دەوڵەتاندا ئەمەش لە پێناوی ئەوەی کە بتوانێ ئەو بەرپرسیارییە گەورەیەی کە لەسەر شانیەتی جێبەجێی بکا. بەڵام بە رەچاوکردنی ژمارەیەك لەو خاڵە لاوازانەی کە رێکخراوەکە پێیانەوە دەناڵێنێ و وێرای شکست هێنانی دەوڵەتانی ئەندام تێیدا، لیبرالیستەکان وایدەبینن کە ئەرکی سەرشانی ئەوانە چاودێریی چالاکییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەو رێکخراوانەش کە لێیەوە پێکهاتوون، لەگەڵ هەوڵدان بۆ چاککردنیان بۆ پاراستنی دادپەروەریی لە تاوتوێکردن و ئەو بریارانەی کە لەو رێکخراوە نێو دەوڵەتییەوە دەردەچن.

## حەوتەم: گۆشەنیگای لیبرالیزم دەربارەی پەیوەندی نێوان دەوڵەتانی پیشەسازیی و دەوڵەتانی رووڵەگەشە

٤٨- بەربەستە سیاسییەکان لەمانەی خوارەوە خۆدەنوێنن:

*دەرفەتەکانی دیموکراسیی لیبرالیزم لە گەشە پێدانی جیهان.

* فرە جۆریی کۆمەڵەکانی دەوڵەتانی رووڵەگەشە کە لە رووی ئابوورییەوە لە بەینی دەوڵەتانی هەناردەی نەوت بۆ دەوڵەتانی تازە کار لە پیشەسازییدا و تادەگاتە دەوڵەتانی هەژار کە پێویستیان بە سیاسەتی جۆر بە جۆر هەیە.

* لایەنە کولتوورییەکان کە پەیوەندییەکی پتەویان بە دیالۆگی نێوان باکوورو باشوور هەیە.

* پەیوەندی نێوان دیالۆگی باکوور وباشوور وبارگرژیی نێوان رۆژهەلات ورۆژئاوا سەرەڕای پێشبرکێی جیهانیی بۆ خۆپڕچەککردن.

٤٩- ناکرێ لیبڕالیزم ئەوە قبوولبکا کە دیالۆگی باکوورو باشوور بگۆرێ تەنیا بۆ ئالۆگۆرێکی بەهای مادی و بازرگانیی و هاوکاری و یاریدەی ئابووری و دوورە دەست بێ لە بەهاکانی کوولتوور، بەلکو دەبێ هزرە سیاسییەکان رۆلێکی گرنگ بگێرن.

لیبڕالیستەکان، مافەکانی مرۆڤ تەنیا لە سێبەری مافە سیاسییەکان و پلورالیزمدا نابینین، بەلکو لە ژێر رۆشنایی مافە کۆمەلایەتییەکاندا. ناکرێ ئەوە قبولێ بکەین کە هەلسەنگاندن بۆ مافەکانی مرۆڤ وکەرامەتی سیاسیی تاکەکەس و نەتەوەییش لە میانی قەبارەی سەرجەمی داهاتی نەتەوەیی[5] ئەنجام بدرێ، یاخوود لە میانی ئامادەکاریی بۆ دەولەت رۆلی کرێگرتەیەك بۆ رۆژهەلات بگێرێ یان چەند بنکەیەکی سەربازیی بۆ رۆژئاوا دابین بکا. ئەوەی کە هۆکاری رێگای خۆ بەدەستەوە دان، یاخوود مایەی وێرانکردنی خود بێ بە لای لیبڕالیستەکانەوە، کە دەولەتانی روولەگەشە جگە لە هەلبژاردنی رژێمگەلێکی توتالیتاریستیی راسترەو یان چەپرەو، شتێکی دیکە لە بەردەمی خۆیدا نەبینێ. دەکرێ لیبڕالیزم ببێتە بناغەیەك بۆ رژێمە ئازادەکان لە دەولەتانی روولەگەشەدا. هەروەکو دوا رۆژی لیبڕالیزم پشت بە ناوچە پیشەسازییەکانی جیهان دەبەستێ لەوەی کە بەهاکانی خۆی بەرەو ناو دەولەتانی روولەگەشە بە هەموو جۆرەکانییەوە بنێرێ.

٥٠- لیبڕالیزم لە دەولەتانی روولەگەشەدا، رێگای سێیەم پێشکەش دەکا و هەر کام لە رژێمەکانی ئیستبدادگەری دیکتاتۆریی یاخوود پەرچە کرداری دامەزراو لە سەر حوکمی ئاینیی یان توتالیتاریستیی کۆمۆنیزم، رەتدەکاتەوە.

لیبڕالیزم گەشەپێدانی هاوسەنگ لە بەینی ئابووریی و کوولتوور و سیاسەت بە پەسەند دەزانێ و رمێنێشی پێدەدا. بەلام مارکسیزم بە دژەوانە ئازادیی سیاسیی

5- الناتج الأجمالي القومي



ملکەچیی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی دەکا کە لە کۆتاییدا دەرەتان نییە بێتە دی تەنانەت لە سەر زەوی خۆشیدا. لەلاکەی دیکەشەوە لایەنگرانی سیستەمی سەرمایەداریی لە حالی ئامادەییدا راوەستاون بۆ ئەوەی هەموو دەسکەوتەکانی پێشکەوتنی ئابووریی و کۆمەلایەتی ملکەچی ئەم ئامانجە ناواقیعیە بکەن.

٥١- لیبڕالیستەکان، راکانی ئەو کەسانە قبولێ ناکەن کە باوەڕیان وایە ئەگەر هاتوو دەولەتێکی رولەگەشە چووە پالێ دەولەتانی بێلایەن، یاخوود حکوومەت پەیرەویی لە رێرەوێکی نەتەوەیی کرد، یاخوود دەولەت نەخشەیەکی ئابووریی توندوتۆلی گەلالە کرد یان چاودێرییەکی پتەوی دارایی هێنایە ئاراوە، ئەوا ئەو دەولەتە لە رژێمە دیموکراسییە لیبڕالیزمەکان دەرچووە یاخوود مانای ئەوە بێ لێیان جیا بۆتەوە.

٥٢- لیبڕالیستەکان وایدەبینن کە مافی گەلان لە ناسنامەی کوولتووریی خۆیاندا گرنگییەکی یەکجار گەورەی هەیە. لیبڕالیستەکان داخوازیی زۆر لە دەولەتانی روولەگەشە لە بارەی پابەندبوونیان بە ناسنامەی کوولتووریی لە سەر حسابی سستیی لە گەشەی ئابوورییان، تێدەگەن وپشتگیریشی لێدەکەن.

٥٣- لیبڕالیستەکان جیهان وەکو یەکەیەکی لە دابەشکردن نەهاتوو دەبینن، ناکرێ پاژێك لە ئاشتیی و بوژانەوەی هەمیشەییدا بژی و وێرای ئەوەش زۆرانێك لە مرۆڤەکان هەبن کە بە دەست هەژاریی و بگرە دەربەدەرییەوە ئازار بچێژن. ئەو مەینەتییەی کە ملیۆنان ئاوارە لە جیهان لە دەولەتانی رولەگەشە بە دەستییەوە ئازار دەچێژن، بێ سێوودوو دەبێ جێگای گرنگیپێدانی راستەوخۆی هەر دەولەتێك لە دەولەتانی پیشەسازیی بێ لە جیهاندا.

٥٤- ئاشکرایە کە جیهان ناتوانێ بۆ ماوەیەکی درێژتر لە سەر رێرەوگەلێکی پەرتو بلاو گەشە بکا کە تێیدا سێ یەکی ژمارەی دانیشتووانی جیهان زیاتر لە دوو لە سێیی سەرچاوەکانی وزەی لە براڕنهاتوو دەسوتێنن. بە رەنگێك کە هاولاتییەکی ئاسایی لە رۆژئاوا لە دەولەتانی پیشەسازیی لە سەر داهاتێك دەژی کە بەرامبەر

داهاتی حەفتا خێزانە لە بەنگلادیش. شۆرشگەلی زۆر، لە سەرینی جیاوازیی توند لە داهات و مولکداریێتی، هەلگیرسان. ئەم جیاوازییانەش ئەمانەن کە لە بنجوبناوانیێکی وەزعی کۆمەلایەتیی و سیاسییەوە هاتوون. ئەمە ریسواییەکە و بە کێشە و ناکۆکیی گەورە هەرەشەمان لێدەکا لە کاتێکدا دەبینین کە دوو لە سێی مرۆڤایەتی لە سەر هێلی هەژاریی بگرە لە خوارووییەوە دەژین، لە کاتێکدا زەویوزاری باشی کشتوکالیی و دارستانەکان سال لە دوای سال وێران دەکرێن بێئەوەی کۆمەلگای نێودەولەتیی یەك هەنگاوی کاریگەر بۆ بەربەستکردنی هەلبگرێ.

٥٥- لەوەڕا کە زۆرێك لە سەرچاوە سرووشتیەکان، بە رێژەیەکی ئەوتۆ بەکاردەبرێن کە تەنیا بەلا و مەینەتیی بۆ نەوەکانی داهاتوو دەهێنێ، ئەمە لە کاتێکدا کە سرووشت توانایەکی سنووورداری بۆ هەلمژینی ئەو بەرەنجامە لاوەکییانە هەیە کە لە چالاکییە پیشەسازییەکانەوە پەیدا دەبن، دابەشکردنی سامان بە جۆرێکی دادپەروەرانەتر، لە رێگەی رژێمگەلێکی ئابووری کە بە هەرەمەکییانەوە روولەگەشەیەکی زیاترە لە نێو دەولەتە پیشەسازییەکاندا، دەرەتانی هێنانە دی لە ئارادا نابێ. ئەمەش لە کاتێکدایە کە کۆمەلە هەولێك دەخرێتە گەڕ بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان وبەکاربردن بۆ ژمارەیەکی روو لە زیادەی دانیشتووانی دەولەتانی رووله گەشە بۆ ئەو ئاستەی کە زۆرینەی دانیشتووانی ئەمریکای باکوور و ئەورووپای رۆژئاوا وژاپۆن وهێندیك لە دانیشتووانی ئەورووپای رۆژهەلات تێیدا دەژین. خۆگرتنەوەی بەردەوامی دەولەتانی ئەنجوومەنی هاوکاری هاوبەشی ئابووری (Comecon).

بۆ پێشکەشکردنی هەر بەشدارییەکی بەردەست بۆ بەدەستهێنانی پێشکەوتنی ئابووریی و کۆمەلایەتی لە نێو دەولەتانی رووله‌گەشەدا، لەو کارانەیە کە شۆکێکی گەورە لەگەل خۆیدا دەهێنێ.

٥٦- هەر بۆیە دابەشکردنی سامان بە جۆرێکی دادپەروەرانەتر، مانای ئەوەیە کە کۆمەلگا پیشەسازییەکان، پێویستە لە سەریان بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش سنوورێك بۆ بە فیرۆدانی کەرەسەی خاو و سەرچاوە لە بڕانهاتووەکانی وزە دابنێن، بگرە پێویستە



لە سەریان کە لە بەکارهێنانی کەرەسەکانی تاکە کەس کەمبکاتەوە بۆ ئەوەی بوار برەخسێنێ لە بەردەم وەبەرهێنانی زیاتری بەرهەمهێن و لە پێناوی گەشەپێدانی ئابووری جیهان بە دەولەتانی رووله‌گەشەشەوە. هەروەها بوار برەخسێنێ تاکو (ئیمتیاز)ە بازرگانییەکان و گواستنەوەی ناوخۆ بۆ ئەو بەشانەی جیهان کە ئاتاجیان پێیە، بێتە دی. بێ سێوودووش تای تەرازووی سەرچاوە سرووشتییەکان دەبێ لە بەرژەوەندی مرۆڤەکان، لەوانەی کە لە سەر لێواری سگ هەلگوشینن، دابێت.

٥٧-پێویستە لیبڕالیستەکان بۆ زامنکردنی پابەندیی دەولەتانی پیشەسازیی بە سیاسەتیی بازرگانی ئازاد، نەك تەنیا لە مامەلەکردن لەگەل دەولەتانی دیکەی پیشەسازیی، بەلکو بە جۆریکی تایبەت و بێ ئاوارتە کردن، لەگەل هەموو دەولەتە رووله‌گەشەکان، گرنگییەکی زیاتر بە پاراستنی ئەو رێککەوتننامانە بدەن کە رووی پەسنکارییان لە بەرژەوەندیی دەولەتە هەژارەکان تێدایە زبە پێچەوانەی ئەو راباوەو، لە مەودایەکی دوور درێژیشدا لە کاتی پەیڕەو کردنی سیاسەتی نموونەیی بازرگانیی لەگەل دەولەتانی رووله‌گەشە، بە کاروبارێکی گەوهەریی دادەنرێ بۆ زیاتر کردنی رێژەی دامەزراندن، نەك کەمترکردنەوەی، لە بەر ئەوە بۆ هەردوو لا بە ئەرێنی دادەنرێ.

٥٨- لیبڕالیستەکان لەو باوەرەدان ئەو بەلێنەی کە دەولەتانی پیشەسازیی داویانە بۆ پێدانی پشتگیریی فەرمیی بە دەولەتانی رووله‌گەشە کە بە رێژەی ٧,٠٪ی سەرجەم داهاتی نەتەوەییە، دەبێ دەسبەجێ جێبەجێ بکرێ. ئەمە کارێکی قبول کراو نییە کە زۆرێك لەم دەولەتانە هێشتا نەگەیشتوونەتە ئاستی ئەم رێژە ناگونجاوەش. بگرە دەبێ کۆششێکی زیاتر لە لایەن هەردوو لاوە بخرێتە گەڕ لە پێناوی هاندانی وە بەر هێنانی تایبەتیی لە دەولەتانی رووله‌گەشەدا کە لە سەر بنەمای بەرهەمهێنان دامەزراوە.

٥٩- دوور لە کاریگەرییەکانی کە بە هۆکاری ئیستعمار و زولم لە بازرگانیی جیهانیی و هاوکاری ئابوورییەوە دێ، دواکەوتن لە گەشە پێدانی ئابووریی لە زۆرێك لە دەولەتانی رووله‌گەشەدا بە هۆی خراپ بەڕێوەبردنی ئابووریی و تێکشکانی سیاسیی لە نێو ریزەکانی دەستەی بژارتە لە میللەتانی رەسەنی ئەو ولاتانەدا، سەر هەلدەدا.

هەر بۆیە لە سەر دەوڵەتانی روولەگەشە، بە تایبەتیش هێزە لیبڕالیستەکانی ئەوان، پێویست دەبێ کە تەئکید لە پێداویستییە بنەڕەتییەکان لە بابەتی کۆکردنەوەی سەرچاوە مرۆیی و مادییەکان، خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان و فێرکارییە گشتییەکان، کۆنترۆڵکردنی گەشەی دانیشتووان، قەڵاچۆکردنی گەندەڵیی، لێهاتوویی کارگێریی وباش کارکردنی رژێمی سیاسیی بکەنەوە. وپێویستە لە سەر لیبڕالیستییەکانی دەوڵەتانی پیشەسازیی کە بە توونەدو مەحکەمیی پشتیوانی لەو کۆششانە بکەن.

٦٠- لە نێو هەموو ئەو هەڕەشە هەرە ترسناکانەی کە لە سەر گەشەپێدانی ئابووریی و کۆمەڵایەتی دەوڵەتانی روولەگەشە هەیە، بارگرژیی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوایە. پێشبرکێی خۆپڕچەککردنیش کە بارگرانییەکی گەورە و بەهێزی لە سەر سیستەمە ئابوورییەکانی دەوڵەتانی پیشەسازیی هەیە، بە کارێکی وێرانکەر بۆ دەوڵەتانی پیشەسازی روولەگەشە دادەنرێ. هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەست لە بێلایەنیی خۆی هەڵبگرێ بۆ ئەوەی پاژێکی روو بە زیاد لەو سەرچاوە سنووردارانەی کە هەیەتی بۆ سیاسەتی سەربازیی یان خۆزلکردنی سیاسیی کە ئازادیی ناوخۆیی، لاواز یاخوود وێران دەکا هەروەکو لەگەڵ پێداویستییە کردەوەییەکانیشدا نالێك دەوەستێتەوە.

## هەشتەم: رێڕەوی پێشکەوتن

٦١-ئیمانی خۆمان بە توانای بێهاوتای لیبڕالیزم، لە رووبەروووبوونەوەی هەڕەشەکان لە سەر ئازادی و بوونی مرۆڤایەتیی و ئاسایش لە بەرامبەر دەستدرێژییە دەرەکییەکان. کە گۆرانکاریی خێرا وئاڵۆزبوونێکی زۆر بە خۆوە دەبینێ، تەنانەت لە جیهانێك کە توتالیتاریستەکان دەوروخولی بەها لیبڕالیستەکانی تێدا دەدەن، مافی هەموو پیاو و ژنێکە کە هەوڵیی گەڕان بۆ بەدەستهێنانی هەرچی زیاتری ئازادیی و کەرامەت و هەلومەرجی باشتری ژیان وئاسایشی زیاتر بدات.



رووبەرووبوونەوەی هەرە گەورەی لیبڕالیزم لە هێنانە دی بەیەکەوەگونجانی هەموو ئەو ئاواتانە، وێرای دووركەوتنەوە لە ئاژاوە و سەرکوتکاریی وئیستبداد، خۆیدەنوێنێ، لە کاتێکدا توتالیتاریستان و ئاژاوە گێران و کۆنە پەرستان و تیرۆرستان خۆیان بە شەڕوشۆری دوێنێوە سەرقاڵ دەکەن.

ئێمە بە تێگەیشتن و روحی هاوکارییەوە دەڕوانینە هەموو هێزە دیموکراسییەکانی دیکە، جا بۆ ئەوەی لە بەرامبەر ئەم رووبەرووبوونەوەیە رابوەستین، گومانی تێدا نییە کە دەبێ شەری ئەمڕۆ بەرپا بکەین و خۆشمان بۆ شەڕی سبەی ئامادە بکەین.

## خشتەی کارەکانی لیبڕالیزم بۆ سەدەی بیست و یەکەم

جارنامەی لیبڕالیزم کە لە کۆنگرەی چل و هەشتەمینی نێو نەتەوەیی لیبڕالیزم کە لە ٢٧-٣٠ نۆڤەمبەری ١٩٩٧ لە نێو ئەنجوومەنی شاری ئۆکسفورد لە شانشینی یەگرتوو بەستراوە، بە ئیلهام وەرگرتن لە دامەزرێنەرانی لیبڕامی نێودەوڵەتیی ئەوانەی کە پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا جارنامەی لیبڕالیزمیان راگەیاند، ٤٧٥ لیبڕالیست لە هەموو گۆشەیەکی ئەم زەوییەوە گەڕانەوە بۆ شاری ئۆکسفورد تا لە ٢٧-٣٠ نۆڤەمبەری ١٩٩٧ کۆبنەوە بۆ ئەوەی لەبارەی کاردانەوەی لیبڕالیستەکان لە بەرامبەر بەربەستەکان و ئەو دەرفەتانەی کە دێنە پێش، لێکۆڵینەوە بکەن، ئێمە ئێستا لە سەر لێواری هەزارەیەکی نوێداین.

لە پەنجا ساڵی رابردوودا پێشکەوتنی زۆر لە چەندین کۆمەڵگادا کە لە سەر بنەمای ئازادیی سیاسی و ئابووری دامەزراون، بە دەست هاتووە، بەڵام هێشتا رێگایەکی درێژمان لە پێشە، بەرەنگێك کە لە سەر نەوەکانی نوێ پێویستە کارە لیبڕالیستییەکان، لە رووبەڕووبونەوەی دەرفەت و مەترسییەکاندا لە ریزی پێشەوەدا دیاری بکەین. بەڵام هێشتا زۆر رووبەڕووبوونەوە لە بەردەم لیبڕالیزمدا راوەستاوە: هەر لە پێشێلکارییەکان بەرامبەر بەمافەکانی مرۆڤ، لە چڕ بوونەوەی دەسەڵات و سامان، لە فیندەمینتالیزم و توتالیتاریزم و ترس لە هەمبەر بیانییان و ئایدیۆلۆجیی رەگەز پەرستانە، لە جیاکاریی لەسەر بنەمای رەگەزپەرستانە، لە جیاکاریی لە سەر بنەمای رەگەز و ئایین و تەمەن و روانینی سێکس و کەمئەندامیی، لە هەژاریی و نەزانیی، لە مەودای جیاوازیی نێوان دەوڵەمەندان و هەژاران، لە خراپ بەکارهێنانی تەکنیکی نوێ، لە لاواز بوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، لە کێبەرکێ لەسەر سەرچاوەی دەگمەن، لە بەر یەکچوونی ژینگە لە جیهانێکی پڕاو پڕ لە مرۆڤ، لە تاوانی بە نەخشە ئەنجامدراو و گەندەڵیی سیاسیی. ئەرکی ئێمە بەو پێیەی کە ئێمە لیبڕالیستانی سەدەی بیست و یەکەمین، ئەوەیە کە هەوڵبدەین بگەینە کۆمەڵە وەڵامێکی لیبڕالیستانە لە بەرامبەر ئەو رووبەڕووبوونە نوێیانە کە دەبنە هۆی بەهێزکردنی ئازادیی تاکە کەس و مافەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگای کراوە و هاوکاریی جیهانیی.



## بەها لیبڕالیستییەکانی ئێمە

ئێمە پابەندیی خۆمان بەو پرەنسیپە لیبڕالیستییانەوە تەئکید دەکەینەوە کە لە جارِ نامەی لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیی لە نیسانی١٩٤٧ دا دیاریکران:

ئازادیی و بەر پرسیاریی تاکە کەس بناغەی کۆمەڵگایەکی شارستانیی پێکدەهێنێ، دەوڵەت تەنیا ئامرازێکە بە دەستی ئەو هاوڵاتییانەوە کە خزمەتییان دەکا، هەر چەشنە هەڵسوکەوتێك لەلایەن دەوڵەتەوە، گومانی تێدا نییە کە دەبێ رێزی پرەنسیپەکانی لێپرسینی دیموکراسیانە بگرێ، ئازادیی دەستووریی پشت ئەستوورە بە پرەنسیپەکانی لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، دادپەروەریی وا پێویست دەکا کە تۆمەتبار لە هەر تۆمەتبارکردنێك بە تاوان، مافی ئەوەی هەیە لە دادگایەکی گشتی و خێرا و دادپەروەرانەی بەدەر لە هەر چەشنە کاریگەرییەکی سیاسی، دادگایی بکرێ.

کۆنترۆڵی دەوڵەت بە سەر ئابووریی و قۆرخکاریی تایبەت هەڕەشە لە ئازادییە سیاسییەکان دەکا، ئەرکەکان و مافەکان لە یەکتری جیا نابنەوە، هەموو هاوڵاتییەك بەرپرسیارییەکی رەوشتیی لە بەرامبەر کەسانیتر لە سەر شانە، جیهانێك کە لە ئاشتیی بەهرەمەند بێ، تەنیا لە سەر بنەمای رێز گرتنی ئەم پرەنسیبانە و هاوکاریی نێوان کۆمەڵگا دیموکراسییەکان، دەتوانرێ دابمەرزێ. ئێمە تەئکید دەکەینەوە کە ئەم پرەنسیپانە دەتوانرێ لە هەموو لایەکی ئەم جیهانەدا پیادە بکرێن. ئازادیی و بەرپرسیاریی و لێکبووردەیی و دادپەروەریی کۆمەلایەتیی و یەکسانیی دەرفەتەکان هەموو ئەمانە لە بەها گەوهەرییەکانی لیبڕالیزمن. ئەم پرەنسیپانە کە گومانی تێدا نییە دەبێ کۆمەڵگای کراوەیان لەسەر دابمەزرێ، هەر ئاوا بە بەردەوامیی دەمێننەوە.

ئێمە باوەڕمان وایە کە مەرجەکانی ئازادیی تاکە کەس بریتییە لە سەروەریی قانوون، یەکسانیی دەرفەتەکان لە بەدەست هێنانی فێربوونی تەواو و هەمە جۆر ئازادیی رادەبرین، ئازادیی کۆبوونەوە، گەیشتن بە زانیاریی، ماف و دەرفەتگەلی یەکسان بۆ ژنان وپیاوان، قبولکردنی هەمە جۆریی و بەهێز کردنی وەبەرهێنانی تایبەت و دەرفەتەکانی لە سەر کار دامەزران. هەروەها

باوەڕمان وایە کە کۆمەڵگای شارستانیی و دیموکراسیی دەستووریی، بناغەیەکی دادپەروەرانەتر و سەقامگیر بۆ سیستەمی سیاسیی دابین دەکا. ئێمە کۆمەڵگای شارستانی وا دەبینین، کە لە هاوڵاتیانی ئازاد پێکهاتووە، لە ژێر سێبەری قانووندا و وێڕای زامنکردنی مافەکانی تاکە کەس و دانانی سنوورێك بۆ دەسەڵاتەکانی حکوومەت و ملکەچپێکردنی بۆ لێپرسینی دیموکراسیانە.

ئێمە باوەڕمان وایە کە ئابوورییەك کە لە سەر بنەمای ڕێساکانی بازاری ئازادی دامەزراوە، دەبێتە هۆی دابەشکردنی لێهاتووانەتر بۆ سامان و سەرچاوەکان و هانی نوێبوونەوە دەدا و نەرم و نیانی بەهێز دەکا.

ئێمە ئیمانمان بەوەیە کە هاوکاریی پتەوی نێوان کۆمەڵگا دیموکراسییەکان لە میانی ڕێکخراوە هەرێمیەکان لە چوار چێوەی قانوونی نێودەوڵەتیی و ڕێز گرتنی مافەکانی مرۆڤ و مافە نەتەوەییەکان و مافەکانی کەمینەکان، سەرەرای پابەند بوونی هاوبەش بە گەشە پێدانی ئابووری لە هەموو لاکانی جیهاندا، هەموو ئەمانە بناغەیەکی پێویستن بۆ ئاشتیی جیهان و پاراستنی ژینگە.

## پێشکەوتنی لیبرالیزم ١٩٤٧-١٩٧٧

ئێمە خۆشحاڵین بەو پێشکەوتنانەی کە لە پەنجا ساڵی رابردوو لە بارودۆخی پرەنسیپەکانی لیبرالیزم لە واری جێبەجێکردندا لە ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتەکاندا بە دەستمان هێناوە:

* گەرانەوەی ئازادی ودیموکراسیی بۆ دەوڵەتانی کۆمۆنیستیی پێشوو لە ئەورووپا
* بڵاوبوونەوەی دیموکراسیی و سەروەریی قانوون.
* کۆتاییهاتنی کۆلۆنیالیزم و دەستکەوتنی دەرفەتی ئۆتۆنۆمی بۆ ئەو گەلانەی کە پێشتر کۆلۆنیکراو بوون.
* پاشەکشێی رۆڵی دەوڵەت لە کۆنترۆڵکردنی سیستەمە ئابوورییە نەتەوەییەکان وێڕای قبوڵکردنی بەربڵاوی ئەو بیرۆکەیە کە سیستەمەکانی ((ئابوریی بازار)) بە لێهاتوویەکی زیاترەوە سامان دەخولقێنێ و لە ئاستێکی بەرفراوانتردا دابەشیدەکا.



* فێرکردن، کە جاران ئیمتیازێك بوو تەنیا بۆ کەمینە قەتیس بوو، بگۆرێ بۆ پرۆسەیەك بە درێژایی تەمەن بۆ ژمارەیەکی روو لە زیادەی هاووڵاتیان.
* رێزگرتنی روو بە زیادی مافەکانی مرۆڤ جا لە ناوەوەی دەوڵەتاندا بێ یان بەو سیفەتەی کە بابەتێکە لە ژێر سەرپەرشتیی نێودەوڵەتیی دایە یان تەنانەت موداخەلەی نێو دەوڵەتیش لە کاتی پێویستدا.
* هۆشیاریی نەتەوەیی و نێودەوڵەتیی روو بە زیادە بۆ مافەکانی ئافرەتان و مندالان و بەرجەستە کردن و بەرفراوانبوونی رووبەری رێساکانی یەکسانیی تا کەمینە نەژادییەکان بگرێتەوە و هەروەها دانپێدانانی هاوتایی لە نێوان هەردوو رەگەزی پیاو ژن بەو سیفەتە کە دەربرینێکی رەوایە لە خولیا تاکەکەسییەکاندا.
* دارشتنی ئابوورییەکی کراوەی نێودەوڵەتیی لە چوار چێوەی رێککەوتنێك لە رێکخستنی نێودەوڵەتیی.
* بەهێز کردنی قانوونی نێودەوڵەتیی و دامەزراوە جیهانیی و هەرێمیەکان.
* زیاتر بوونی ئازادیی بەدەستهێنانی زانیاری و پەیوەندیی و سەفەر لە ناوەوەو دەرەوەی سنوورە نەتەوەییەکان.
* قبوڵکردنی ئەوەی کە بەرپرسیاریی هاوبەش لە ناوەوەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیی بەرفراوان دەبێ تاکو پابەند بوونی هاوبەش بەرەو مامەڵە کردن لەگەڵ هەژاریی لە جیهاندا و پاراستنی ژینگەیی جیهان بگرێتە خۆی.

## ئەو بەربەستانەی٦ کە رووبەرووی ئەم نەوەیەی ئێمە دەبنەوە

ئێمە ئیقرار بەوە دەکەین کە ئەم دەستکەوتانە. تەنیا بۆ ژمارەیەکی کەم لە مرۆڤەکان هاتوونەتە دی. ئەو بەربەستانەش لە پەنجا ساڵی داهاتوودا رووبەروومان دەبنەوە، لە بنیاتنان لە سەر ئەوانە کە تا ئێستا هاتوونەتەدی، خۆیدەنوێنێ.

6- التحدی

لەگەڵ بڵاوکردنەوەی پرەنسیپەکانی لیبراڵیزم لە گشت گۆشەیەکی جیهاندا وێرای کەڵك وەرگرتن لە هێزەکانی گۆڕان لە پتەو کردنی گەشەپێدانی کۆمەڵگا کراوەکان، نەك هەڵتەکاندنی.

**ئەو بەربەستانەی کە رووبەروومان دەبنەوە بریتیین لەمانە:**

## ١- بەربەستەکانی بڵاوکردنەوەی دیموکراسیی:

دواجار دیموکراسیی لیبراڵیزم بەو سیفەتەی کە مۆدێلێکی جیهانییە بۆ رێکخستنی سیاسیی بوو، بە مووديلێکی قبوڵکراو. بەڵام تەنیا ژمارەیەکی کەمی دەوڵەتان بە دیموکراسیی راستەقینە وەسف دەکرێن. ئێستاش بەربەستەکانی وەکو رژێمە ئیستیبدادییەکان، توێژی بژارتەی سەربازیی کە دەستی بە سەر دەسەڵاتدا گرتووە، خراپی بەکارهێنانی دەسەڵات بۆ مەرامی تەنیا کۆمەڵەیەك، کۆمەڵە کەسانێکی تاوانکار کە دەستیان بە سەر حکومەتەکاندا گرتووە، ئەوانەی کە گوریس راکێشانیانە لە سەر دەسەڵات لەوانەی کە ئاواتەکان و ترسەکانی جەماوەر بۆ مەبەستی خۆیان بەکار دەهێنن، دێنە سەر رێگای ئازادی. هەر بۆیە بانگەوازی گشت حکومەت و میللەتان دەکەین:

* لە پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتیی خۆیاندا، لە بەرژەوەندی ئەو حکوومەتانە خۆیان تایبەت و جیا بکەنەوە کە رەچاوی رێساکانی مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسیی دەکەن.
* بەتاڵکردنەوەی حوکمی لە سێدارە دان لە گشت گۆشەیەکی جیهاندا.
* بەهێز کردنی سەروەریی قانوون و پتەو کردنی فەرمانڕەوایییەکی باش لە سێبەری دیموکراسییەکی رەسەندا.
* دووبارە ئاراستە کردنەوەی خەرجیی گشتی دوور لە خەرجیی سەربازیی و بە ئاراستەی وەبەرهێنانی سەرمایەی کۆمەڵایەتی ودرێژە پێدان و لە نێو بردنی هەژاریی.



* سنووردانان بۆ فرۆشتنی چەك و قەدەغە کردنی فرۆشتنی کەرەسە و ئامرازی سەرکوتکردن بە رژێمی نادیموکراسیی، وێڕای زیاتر کردنی لێهاتوویی تۆماری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ چەکە کلاسیکییەکان.
* قەڵاچۆکردنی گەندەڵیی وتاوانی بە نەخشە ئەنجامدراو و تیرۆر.
* رمێندان بە راگەیاندنێك کە لە چاودێریی ناپێویستی حکوومەت یان کۆمپانیا خاوەن هەیمەنەکان بەدەر بێ.
* کارکردن لە رێگەی فێرکردنەوە بۆ چاندنی گرنگیی لێکبووردەیی بۆ بوونی کۆمەڵگایەکی شارستانیی.

## ٢- بەربەستی توندوتیژیی و حوکمێکی باش لە سەر ئاستی جیهان

لە جیهانێکدا کە پڕاوپڕە لە ململانێی توندوتیژ، ئەرکی بە پەلە، گەیشتنە بە ئامرازێکی سەرکەوتوو بۆ دوور کەوتنەوە لە توندوتیژیی. هەروەها ئەو جیهانەی کە تێیدا هەمووان پشت بە یەکتری دەبەستن، پێویستیی بە ئاستێکی بەرزی هاوکاریی نێودەوڵەتیی هەیە بۆ بەهێز کردنی سیستەمێکی جیهانیی پڕ لە ئاسایش و پارێزراوو دادپەروەر.

تاوانی ئەودیو سنووره نەتەوەییەکان، نەخۆشییە سەختەکان، ئاڵوودە بوونی ژینگە و هەڕەشەکانی گۆڕانی کەشوهەوا هەموویان، پەخەگیریی زیاتر لە بەردەم هاوکاریی نێودەوڵەتیی پێکدەهێنن. لیبراڵیستەکان بۆ ئەم پرسە پابەند دەبن بە بەهێزکردنی حوکمی باش و لەبار لەسەر ئاستی جیهان لە میانی دادگای نێودەوڵەتیی تاوانەکان، کە خاوەنی چوار چێوەیەکی تایبەتمەندە لە تاوانەکانی جەنگ. ئامانجی ئێمە لە سەدەی بیست و یەکەمدا ئەوەیە کە جیهانێکی لیبراڵیستی دابمەزرێنین کە بە شێوەیەکی مەحکەم پشت ئەستوور بێ بە سەروەریی قانوون کە لەلایەن دامەزراوە جیهانیی و هەرێمییەکانەوە پشتگیریی لێبکرێ.

### ٣- بەربەستی چاککردنی دیموکراسیی:

ئیقرار دەکەین کە پراکتیکە دیموکراسییەکان بێ سێوودووو دەبێ ئەوەندە درێژ ببێتەوە کە بتوانێ چاوەڕوانیی کۆمەڵگاکان لە رووی کولتوور و فێرکردنەوە تێر بکا و لە هەمبەر حکوومەتەکاندا لە ئومێد بڕان بیانپارێزێ هاوولاتیان شایانی ئەوەن کە دەرفەتی باشتریان بۆ بەدەستهێنانی زانیارییەکان هەبێ، چاودێریی پەرلەمان لە سەر دەسەلاتی جێبەجێکردن زیاتر بێ، دەرفەتگەلی زیاتر هەبێ بۆ گێڕانی رۆڵێکی چالاکانەتر لە ژیانی گشتی و هەروەها مافی لێپرسینەوەیان لە حکوومەتەکانی خۆیان هەیە. بێگومان دەبێ رێزی پەرنسیپی ناناوەندێتی لە دابەشکردنی دەسەلاتدا بگیرێ تاکو سەربەخۆیی بدرێتە ناوچە پەرتوبلاوەکان و کۆمەڵگا ناوچەییەکان.

ناناوەندگەریی چالاکانەش لە دەسەلاتی سیاسیی و تەسلیمکردنی بەو کۆمەڵگایانە کە لە سەر بنەمای ئۆتۆنۆمی دامەزراون، باشترین رێگەیە بۆ تواناداان بە هاوولاتی.

### ٤- بارگرژیی لە نێوان ئۆتۆنۆمی و مافەکانی مرۆڤ:

ئۆتۆنۆمیی و بە تایبەتیش سەروەریی دەوڵەت، لەوانەیە لەگەڵ ئازادیی تاکەکەسی و مافەکانی مرۆڤدا بەریەك بکەون. رژێمە توتالیتاریستییە ئیستبدادییەکان، ئەم پەرنسیپی سەروەرییە بە خراپی بەکاردەهێنێ لە پێناوی رێگە نەدان بە موداخەلە کردن بۆ یارمەتیدانی ئەوانەی کە لە ئازادیی خۆیان بێبەشن.

هەر بۆیە لیبرالیستەکان پێداگریی لە سەر ئەوە دەکەن کە مافەکانی مرۆڤ گشتێکەو لە پارە پارە کردن نایەت و، لە سەر ئینتیما بۆ هیچ کۆمەڵەیەکی نەژادیی یان کۆمەڵایەتی یان رەگەزیی یاخوود ئینتیما بۆ ئایین یان حیزبی سیاسیی قۆرخ نەکراوە. گومانی تێدا نیە کە دەبێ رێککەوتنێك بە کۆتا بگا بۆ دانانی سزای گونجاو کە لە لایەن



کۆمەڵگای نێودەوڵەتیی ئیمزای لە سەر کرا بێ لە دژی ئەو حکوومەتانەی رەچاوکردنی پرەنسیبەکانی کۆمەڵگایەکی کراوەی نێودەوڵەتیی رەتدەکەنەوە.

### ٥- بەربەستی هەژاریی و پەراوێز خستنی کۆمەڵایەتی

هەژاریی وبێکاریی و پەراوێز خستنی کۆمەڵایەتی، ژیانی پیاوان و ژنان و منداڵان بە تایبەتیش بەساڵاچووان، تووشی بەڵا و نەهامەتیی دەکا و مەترسیگەلێکی گەورە لە سەر کۆمەڵگای شارستانیی پێکدەهێنێ. هەژاریی نائومێدی دەخاتەوە، نائومێدیش، زێدەڕۆیی و دەمارگیریی و دەستدرێژیی دەخاتەوە. پرسیاری گەوهەرییش لە بارەی سنوور دانان بۆ هەژاریی ئەوەیە کە چۆن دەتوانرێ کۆمەڵە ئامرازێك دابینبکرێ کە توانا بە خەڵك ببەخشێ بۆ خۆیان بەربەرەکانیی هەژاری بکەن و خۆیان هەژاریی لە بەر خۆیان داماڵن. ئێمە داوای سیاسەتێکی چالاك دەکەین کە دەرفەتی فێرکردن و لە سەر کار دامەزران و پشتگیریی بۆ ئەوانە بجوڵقێنێ کە ناتوانن یارمەتی خۆیان بدەن، سیاسەتێك کە پشت ئەستوورە بە هاوبەشیی نێوان هەردوو کەرتی گشتی وتایبەت. هەروەها پێویستە کە دامەزراوە گشتیەکان و سیستەمەکانی خۆشگوزەرانی نەرمونیانی زیاتر بنوێنن بە گوێرەی تواناش ملکەچی بەرێوەبەرایەتیی ناوچەیی بن و ئەمەش بە ئامانجی بەهێز کردنی بەرپرسیاریی تاکەکەس و وەڵامدانەوەی هەموو هەلومەرجەکانی تاکە کەس دەبێ.

### ٦- بەربەستی حکوومەتی کەم ژمارە

ئەو باوەڕە هەڵەیەی کە حکوومەت لە بەرامبەر قانونگوزاریی بۆ بەختەوەریی گەل بەرپرسیارە، رووبەرووی قەیران بۆتەوە، بگرە لەسەر ئاستی هەموو جیهاندا لە سەر لێواری هەرەسهێناندایە، لە زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتانی پیشەسازی سیستەمی

بیمەی کۆمەڵایەتی کە زێدە رۆیی تیدا کراوە و، بە دەست خراپ ئاراستەکردنی بوودجەی دەوڵەتانەوە دەناڵێنێ،هەرەشەی بارگرانییەکی روو بە زیادەی قەرزی گەورە لە سەر نەوەکانی داهاتوو پێکدەهێنێ. لە دەوڵەتانی رووڵەگەشەش هەموو هەوڵەکان بۆ بەهێز کردنی گەشە پێدان لە رێگەی حکوومەتەوە بە تەنیایی یاخوود بە شێوەیەکی بنەرەتیی لە سەر حکوومەت بەندە، ئەوا ئەنجامەکەی تێکشکان بووە، چونکە حکوومەت بارگرانییەك هەڵدەگرێ کە دەروەستی نایە و دەستپێشکەرە تاکەکەسییەکان دەخنکێنێ. لیبرالیستەکان ئیقرار دەکەن کە تواناکانی حکوومەت سنووردارە و ((حکومەتی گەورە)) و پەرەسەندنی خەرجییەکان لە لایەن دەوڵەتەوە، لە هەرەشە ترسناکەکانن بۆ سەر کۆمەڵگای ئازاد، سنووردانان بۆ قەبارەی حکوومەت و دەستپێوەگرتنی خەرجییەکانی حکوومەت بە کارە هەوەڵییەکان دادەنرێ.

## ٧- پێویستیی گرێبەستییەکی نوێ لە نێوان نەوەکان

ئیقرار بەو بارگرژییانە دەکەین کە لە بەینی گوشاری دەسبەجێی خواستن و بەکاربردن و بەرژوەندە مەودا دوورەکانی کۆمەڵگا و ژینگە، کە حکوومەتەکان، بەو سیفەتە کە پاسەوانی کۆمەڵگاکانن، گرنگیی پێدەدەن. ئێمە هەوڵی گرێبەستێکی نوێ لە بەینی نەوەکان دەدەین، ئیقرار بەو ئیمتیازە دەکەین کە بەکاربەران[7] و هاووڵاتییانی ئێستا لە وەبەرهێنانەکانی پێشوو بە دەستیانهێناوە، وێرای ئەو بەرپرسیارییەی کە بۆ پاراستنی ژینگەی سرووشتی و سامانە کولتوورییەکان و موڵکومالی گشتی و سەرمایەی کۆمەڵایەتی لە بەرامبەر نەوەکانی داهاتوو دەکەوێتە سەرشانیان. بێگومان دەبێ نرخەکان، خەرجییە شاراوەکانی ئالوودە بوون و سوود وەرگرتن لە سەرچاوە سرووشتیەکان، رەنگبدەنەوە.

7- بەکاربەر: مستهلك



## ٨- بەربەستەکانی پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژی

خۆشحاڵین بەو دەرفەتگەلە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەی کە تەکنیکی نوێ و داهێنانە زانستییەکان دابینی دەکا. هەروەکو ئیقرار بە پێویستیی پێداچوونەوەی شوێنەوارەکانی و ئەگەری خراپ بەکارهێنانی دەکەین سەرەڕای شوێنەوارەکانی لە سەر رێکخستنی نەتەوەیی و نێودەوڵەتیی. بێگومان دەبێ پرەنیسپی خۆپاراستن، بەو سیفەتەی کە پرەنسیپی باوە لە گشت کەرتەکانی چالاکییەکانی مرۆڤ، پەیرەوی لێبکرێ. ئەم کارەش بە شێوەیەکی تایبەتی بە سەر ئەو هەڕەشانەدا دەسەلمێ کە لە گۆرانکارییەکانی کەش و هەوا دەبن کە لە سەر مرۆڤایەتی پێویست دەکا دەسبەجێ رووبەرووی ببێتەوە.

هەروەکو پێویستییەکی بە پەلەمان بە کۆمەڵە رێکەوتنێکی تەوزیمی و کۆمەڵە خشتەیەکی زەمەنیی هەیە بۆ دانانی سنوورێك بۆ بەکارهێنانی سووتەمەنیی ژێر زەویی.

هیچ سێوو دوو لەوەدا نیە کە دەبێ بەکاربردن تەنیا لە سەر ئەو وزە نوێکەرەوانە قەتیس ببێ کە لە سیستەمی ژینگەدا هەیە. هەروەها وا پێویست دەکا کە هەموو مادە کیمیاوییەکان و ئەو مادانەش کە ملکەچی ئەندازەی بۆماوەیی بوون و بەرهەمە کشتوکاڵییەکانیش بە جۆرێکی لەسەرخۆ تاقیبکرێتەوە بەر لەوەی لە سەر ئاستیی بازرگانیی بەکاربهێنرێن. هەروەها خۆشحاڵین بەو شۆرشی گەیاندنە کە دەرفەتگەلی نوێ دەرەخسێنێ بۆ بەهێز کردنی داهێنان و ناناوەندێتی و سەربەخۆیی تاکەکەس و دەستپێشکەریی.

لیبڕالیستەکان پێداگریی لە سەر کەناڵە جۆربەجۆرەکانی گەیاندن دەکەن کە لە رێگەی کێبەرکێوە لە بازارە ئازادەکاندا هەیە. بەڵام زانیاریەکان و تۆڕەکان و پەیکەرەکانی دیکەی گەیاندن، بێگومان دەبێ لە سەر ئاستێکی بەرفراوان بڕەخسێن لە رێگەی سیستەمی کراوە بۆ بەرهەمهێنەران و بەکاربەران و قەوارەکانی بەرژەوەندییە گشتییەکان.

## ٩- بەربەستەکانی ئامادەکردنی بازاڕی کراوە

کۆمەڵگا کراوەکان پێویستیان بە بازارگەلی کراوە هەیە. کۆمەڵگای لیبرالیستی وخاوەن لێکبووردەیی، پێویستی بە ئابووری بازار هەیە. ئازادییە سیاسییەکان و ئازادییە ئابوورییەکان سەر بە یەکترین. لەگەڵ دابینبوونی بازاری هزرەکان و داهێنانەکان و وێرای کێبەرکێ بۆ گەیشتن بە باشترین چارەسەر، ئابووریی بازار پێشکەوتنێکی دینامیکی دەخولقێنێ و باشترین دەرفەت لە ژیانێکی سەربەخۆدا دابیندەکا.

هاوکات لەگەڵ دابینبوونی پرەنیسپی گشتی کە پارێزگاریی لە موڵکداریێتی گشتی دەکا و، چوارچێوەی قانوونییش کە قۆرخکارییەکان قەدەغە دەکا، بازاری کراوە، دەستپێشکەریی تایبەتی و ئامرازی ئابووریی بۆ پشتگیریی کۆمەڵایەتی دەخولقێنێ. هەر بۆیە رێکخستنە بیروکراتییەکان لە سیستەمی ئابووریی بازار و مەزهەبگەلێکی کە گرنگیی بە پاراستن دەدەن، بە بەربەستی دەرفەتەکان و وەزیفە نوێیەکان دەژمێردرێن جا چ لە دەوڵەتانی روولەگەشە و چ لە دەوڵەتانی پیشەسازییدا بێ. جا لە پێناوی گەشەپێدانی بەردەوام لە رووی ژینگە و کۆمەڵایەتییەوە، هیچ سێودووی تێدا نییە کە دەبێ گرنگیدان لە سەپاندنی باج لە سەر کرێکاریی، بگۆرێ بۆ گرنگیدان بە سەپاندنی باج لە سەر بەکاربردنی وزە و کەرەسەی خاو. بێ ئەم گۆرانەش ئەوا کێشەکانی ژینگە و بێکاریی، زیاتر بەرەو توند بوون دەچن.

## ١٠- بەربەستەکانی گەشەپێدان لە هەموو جیهان

حکوومەتەکانی گەندەڵ و ستەمکار، دەوڵەتان و کۆمەڵگا لاوازەکان، بێکاریی، نەخوێندەواری و پووردەانی دانیشتووان هەموویان لە داتەپینی ژینگەدا بەشدارییدەکەن، هەروەکو پۆل پۆل کۆچیاران و پەنا بەران دەخولقینن و شۆڕش دژی رژێمی سیاسیی و کۆمەڵایەتی بەرپا دەکا. بەرژەوەندی درێژخایەنی جیهانی پێشکەوتوو لەوەدایە کە هانی پێشکەوتنی مرۆیی بدات و یارمەتی گەشەپێدانی ئابووریی دەوڵەتانی هەژار بدات، ئەمە سەرباری ئەوەی کە بەرپرسیارییەکی رەوشتیشە.



لەوێرا کە بازاڕە کراوەکانی جیهان باشترین ئامرازی بەهێز کردنی بووژانەوەن لە هەر کام لە دەوڵەتانی هەژارو دەوڵەمەندیشدا، ئەوا لە سەر لیبرالیستەکان پێویست دەبێ کە دووبارە تەئکید لەو دڵنیبیایەی خۆیان بکەنەوە کە بازرگانیی ئازاد لە میانی رەخساندنی دەرفەت بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە رووی ئابوورییەوە لاوازن، بە دڵنیاترین ئامراز دادەنرێ بۆ زاڵبوون بە سەر هەژاری لە هەموو جیهاندا. هەر بۆیە بەرهەڵستیی پاراستنی ئابووریی وەك پابەندییەکی لیبرالیستانە دەمێنێتەوە.

لە کاتێکدا لە سەر لێواری سەدەی بیست ویەکەمین داین، خۆمان، بەو سیفەتەی کە لیبرالیستین، پابەن دەکەین کە هاوشانی یەکتری کاربکەین لە پێناوی رووبەروو وەستانەوە لەگەڵ ئەو یەخەگیرییانەدا، هەروەها تەئکید لە پابەندیی لیبرالیستانەمان دەکەینەوە کە ئازادیی و کەرامەتی هەر مرۆڤێك بکەین بە تەوەرەی ژیانی سیاسیی خۆمان.

هەروەکو کۆنگرەی ٥٢ی لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیی لە داکار لە سینگال لە ٢٣-٢٥ ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣ دا پەسندی کردووە:

## ئەمە مایەی گرنگیپێدانی ئێمەیە:

راپۆرتی تایبەت بە ناونیشانی ((ئیسلام و رۆژئاوا روانینێکی لیبڕالیستانە)) کە گوتوبێژ لە سەر بابەتەکانی حوکم لە دەوڵەتانی ئیسلامیی دەکا.

## ئێمە ئیقرار دەکەین کە:

* کولتووری هزری و زانستیی کە بە شێوەیەکی گشتی بە ناوی ((رۆژئاوا)) وە دەناسرێ لە واقیعی حاڵدا کەلەپوورێکە ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتانی جیهان، بە جیهانی ئیسلامیشەوە بەشدارییان تێدا کردووە.

* هەموو ئایینە گەورەکان زیانیان لەلایەن ئەو کۆمەڵانەوە پێگەیشتووە کە لە لێکبووردن و کرانەوەی هزریی و مافەکانی مرۆڤ هەڵگەڕاونەتەوە.

* کە جیهانی ئیسلامیی هەمە جۆرە، بە رەنگێك کە وڵاتانی ئەوتۆی تێدایە کە زۆرینەی موسڵمانە بە رەنگێك کە هێندێك لە خۆشیان وای پۆلین دەکا کە لە دەوڵەتانی موسڵمانە، بەڵام لە هەمان کاتدا لە پیادە کردنی ئیسلام لە رووی سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە جیاوازە، بگرە لە رووی رێکخستنی سیاسیی و ئابووریشەوە جیاوازە.

* سیاسەت و پراکتیکگەلی دژە لیبڕالیزم کە لە لایەن زۆرێك لە دەوڵەتانی ئیسلامییەوە بنیات دەنرێ، نابێ بە شێوەیەکی میکانیکیی ئەوتۆ تەماشا بکرێ کە نوێنەری هەڵوێستە راستەقینەکانی میللەتەکانییەتی.

* زۆریك لەو دەوڵەتانە، هەڵگری جیاوازییگەلێکی گەوهەرییە لە بەینی خودی موسڵمانەکان لە لێروانینیان بۆ رژێمێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی نموونەییتر،

* پرۆسەی نوێکردنەوە لە زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا زۆر کاتی وا هەیە بە هۆکاری دەستێوەردان و لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا بە هۆکاری داگیرکاریی هێزە دەرەکییەکان بۆ



ئەو دەوڵەتانە، تووشی ئاڵۆز بوون هاتووە. بە تایبەتیش لە هەردوو سەدەی نۆزدە و بیستدا، ئەم کارەش کاریگەریی لە سەر گەشەپێدانی ئابووریی ئەو دەوڵەتە داناوە و، هێندێك لەو جووڵانەوە پێشکەوتنخوازییانەی کە لە ناوەوە سەریان هەڵداوە، تووشیی کەمئەندامیی یان شێواویی کردووە.

* ژمارەیەك لەو دەوڵەتە ئیسلامییانەی کە بە درێژایی دوو نەوە یان زیاترە لە سەربەخۆیی خۆی بەهرەمەند بووە، خراپیی حوکم تێیدا - هەروەکو لە ژمارەیەك لە دەوڵەتانیشدا هەیە بەشداریی کردووە لە تێکشکانیی پڕکردنەوەی ئەو کەلەبەرە ئابوورییەی کە هەیە.

* گەرچی (شوری- راوێژ و پرسکردن) مەرجێکی بنەڕەتییە لە ئیسلامدا، بەڵام پرۆسەی (شوری) لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بە بڕێکی ئەوەندە تەواو بەرفراوان نییە کە بتوانێ توێژی بژاردەی فەرمانڕەوا لە سەپاندنی حوکمێك بەربەست بکا کە خزمەتی مەرامەکانی خۆیدەکا، ئەمەش دەبێتە هۆی تێکشکانی ئەوەی کە حوکمێکی دادپەروەرانە بۆ هەموو گەل دابینبکا.

* هاندان بۆ چاکسازیی ئیسلامیی، پەیگیر تر بووە، ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەی کە بیرمەندە موسڵمانەکان پەییان بەوە بردووە کە ئەو ئایدۆلۆجیایەی کە توێژی بژاردەی فەرمانڕەوای موسڵمان رمێنی پێدەدا، نەبۆتە هۆی پێشکەوتنێکی سیاسیی یان کۆمەڵایەتی خاوەن ناوەڕۆك لە نێو کۆمەڵگا موسڵمانەکاندا.

## ئێمە تەئکید دەکەینەوە لە:

* کە رۆژئاوا و کڵێسا و دەوڵەت بە شێوەیەکی گشتی لێك هەڵوێژێرراون، لیبڕالیستەکان ئەم کارە بە یەکێك لە دەستکەوتە گرنگەکان دەبینن لە کاتێکدا هێشتا دەوڵەتانی ئیسلامیی سەرقاڵیی مشتومرە لە سەر رۆڵی سەرکردەکانی ئایین لە سیاسەتدا، هەروەکو لە حاڵی ئێستاش دژوارییەك لە تێگەیشتن بۆ پرسی لێکهەڵوێژاردنی باوەرە رەوشتیەکان لە بەرێوەبەردنی سیاسەت سەرهەڵدەدا، بە دووی ئەمەدا مانای وایە ئایین لە گێڕانی رۆڵێکی گرنگ بەردەوام دەبێ کە هێندیك جار لە ژمارەیەك لە دەوڵەتانی ئیسلامییدا لەگەڵ پێدراوەکانی سیاسەتدا رێکناکەوێ.

ئەو هەوڵانەش کە بۆ داڕشتنی حکوومەتگەلێك دەدرێ کە لە سەر بنەمای حوکمێکی ئایینی دەمارگیرانە دامەزراوە، لەگەڵ رۆحی ئیسلامیی راستەقینەدا دژەوانە رادەوەستێتەوە.

* چاكسازیی سیاسیی و كۆمەڵایەتیی و قانوونیی و ئابووریی بە پێویستییەك دادەنرێ بۆ بنیاتنانی چوارچێوەیەكی دامەزراوەیی بەهێز، كە ڕێگا بۆ تاكەكان دەرەخسێنێ تا توانای مرۆیی خۆیان پەرە پێبدەن، ئەم چاكسازییانەش نابێ لە لایەن ئیسلامەوە وا سەیر بكرێ كە هێرشكردنە بۆ سەر ئیسلام لە رووی ئایینییەوە، بەڵكو ئاراستە كراوە بۆ لایەنگیرییە توندەكان و ئەو بەرژەوەندانەی كە لە پشت ئەوانەوە شاردراونەتەوە.

* فێركردنێكی باش بە ئامرازێكی بنەرەتیش دادەنرێ بۆ جووڵاندن و هاوئاهەنگیی كۆمەڵگا هەروەكو بە مەرجی بنەڕەتیش دادەنرێ بۆ پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی و ئابووریی و زانستی تەكنیكی.

## هەروەها ئەمە بە بایەخ پێدانەوە وەردەگرین:

راپۆرتی گەشەپێدانی مرۆیی بۆ ساڵی ٢٠٠٣ كە لە ژێر چاودێریی نەتەوە یەكگرتوەكان بڵاوبۆتەوە ئەم راپۆرتە كەمییەكی توونـد لـە وەبەرهێنانـدا و، داتەپینی سیستەمەكانی فێركردن لە باری چۆنایەتییەوە لە ژمارەیەك وڵاتانی عەرەبیدا روونەكاتەوە، فێركردنی نێرو مێ ئامرازێكی گرنگە بۆ زاڵبوون بە سەر قۆرخكردنی زانیارییەكان و شیكردنەوەی حكومەتەكان و كۆمەڵە ئاینییەكان وسیاسییەكان لەوانەی كە خاوەن دەسەڵاتن.

## لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیی:

* تەئكید كردنەوەی خۆی لە سەر ئازادیی ویژدان وئایین وەكو مافێكی بنەرەتیی گشتی دووبارە دەكاتەوە. هەموو مرۆڤێك مافی هەیە تا بە ئازادیی پراكتیكی ئایینەكەی خۆی بكا بێ هیچ كۆتوبەندێك كە قانوون یان مافەكانی مرۆڤ دەیسەپێنێ. هەموو مرۆڤێك مافی ئەوەی هەیە ئەو ئایینە هەڵبژێرێ كە خۆی پەسندی دەكا بێ ئەوەی ملكەچی هیچ جۆرە سەركوتكارییەك یان جیاكارییەك یان چەوسانەوەیەك بێ لە هەر شوێنێكی جیهاندا.

* تەئكید كردنەوەی خۆی بە جۆرێكی تایبەت لەوە دووبارە دەكاتەوە كە مافە بنەڕەتییەكانی تاكەكەس، بێ رەچاوكردنی رەگەز پیادە دەكرێ، بەكارهێنانی ئاین وەكو ئامرازێك بۆ دەستدرێژی كردنە



سەر ئەم مافانە قەدەغەیە، خوێندنەوەی راست بۆ ئیسلام ئەوەیە كە تەئكید لە یەكسانیی ئافرەت دەكاتەوە لە هەموو لایەنەكانی ژیاندا، ئەگەر چی ئەم یەكسانییە لە دەوڵەتانی ئیسلامدا پراكتیكیش نەكراوە. هیچ گومان لەوەدا نییە كە دەبێ هەڵاواردنی مرۆڤ لە سەر بنەمای جۆریی كۆمەڵایەتی و خراپەكاری دەرهەق مافەكانی مرۆڤ بەناوی ئایینەوە، لەنێو ببرێ. لە لایەكی دیكەوە گومانی تێدا نییە كە دەبێ تێبینی ئەوە بكرێ كە چوار دەوڵەتی هەرە گەورەی ئیسلامی (ئیندونیسیا و پاكستان و بەنگلادیش وتوركیا) ئافرەت تێیدا گەیشتووەتە پلەی سەرۆكی حكومەت.

* داوای لێكهەڵوێژاردنێكی[8] روون دەكەین لە بەینی ئایینی رێكخراوو دامەزراوەكانی دەوڵەت. لە كاتێكدا ژمارەیەك لە خەڵك پەیرەوی كاری ئایینی ئەنجام دەدەن ولە سیاسەتیشدا بەشداریی دەكەن، ئەوا هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێكی ئاینی دەبێتە هۆی زیاد بوونی كێشەوبەرەی كۆمەڵایەتی و سیاسیی و زوڵم.

* وێرای بانگەواز كردن بۆ دەوڵەتانی عیلمانی، لیبڕالیستەكان هۆشداریی لەوە دەدەن كە زاراوەی عیلمانی بە خراپیی سوودی لێوەربگیرێ یان تێكەڵكارییەك لە شیكردنەوەی زاراوەكەدا بكرێ، لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیی تەئكید دەكاتەوە كە وشەی (عیلمانی) بە واتای ئەوە نییە كە حكومەت دژی ئاین بێ، بەڵكو بە واتای ئەوەی كە حكومەت بێلایەن بێ، واتە حكوومەت مامەڵە كردن لەگەڵ پەیرەوانی هەموو ئاینییەكان و لەگەڵ هەموو ئەوانەش كە هیچ ئاینێك پەیرەو ناكەن، بە مامەڵەیەكی یەكسان مادام بە قانوونەوە پابەند دەبن، بەڕێوە دەبا.

* تەئكید لە گرنگیی دەستوورەكان، بەو سیفەتە كە بەشداریكردنێكی گرنگە بەرەوە هێنانە دی پێوەرەكانی مافەكانی مرۆڤ و لێكبووردەیی ئایینی و ئەتنیكیی نەژادیی دەكەینەوە.

## هەر بۆیە لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیی رایدەگەینێ:

هەموو پشتگیرییەك كە لە توانادایە، بێ سێوودوو دەبێ ئاراستەی رزگاری و گۆڕان بەرەو دیموكراسیی لە دەوڵەتانی ئیسلامیی بكرێ. پێویستە ئەم پشتگیرییە

---

[8]- فصل السلطات

بەرەو ئەو دیوی حکوومەتەکان و سیستەمە بیرۆکراتییەکانی دەوڵـەت درێـژ ببێتـەوە. بێ سێوو دەبێ ئاراستەی رووکردنە کۆمەڵگای شارستانی هانبدرێ و بەهێز بکرێ.

* هیچ گومانی تێدا نییە کە دەبێ کولتوورە سیاسییە تایبەتەکانی دەوڵەتی ئیـسلامی بە چاوی بایەخەوە وەربگیرێ ئەم نەریتانە حوکم بە سەر ڕێڕەوی دوا ڕۆژی چاکسازییدا دەکەن لـە جیهانی ئیسلامدا، بەڵام نابێ بە سیفەتی پاساوهێنانەوە بۆ پێشێلکارییەکانی مافەکانی مـرۆڤ و ئازادییەکان یاخوود بۆ پاشخستنی چاکسازییە لیبڕالیستیی و دیموکراسییەکان بەکاربهێنرێ.

* پێویستە هەمان ئەم پێوەرانە بە سەر هەموو دەوڵەتەکانی جیهانی ئیسلامی جێبەجێ بکرێ بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئەو دەوڵەتە هاوپـەیمانی ڕۆژئاوایـە یـا نـا، پێویستیشە گرنگیی جوگرافی و سیاسیی دەوڵەتێك بە شێوەیەکی ئەرێنی کار نەکاتـە سەر دەرفەتەکانی دانیشتووان لە بەهرەمەندبوونیان لە ئازادیی تاکەکەس.

* ململانێی نێوان ئیـسرائیل و فەڵەسـتین تـەنیا بـە ڕێگـەی ئاشـتیی دەتـوانرێ چارەسەر بکرێ، وێـرای دانـانی گوشـار بـۆ گەیـشتن بـە ڕێگاچـارەیەك. لیبرالییـستەکان وایدەبینن کە بەرپرسیاریی وەلانـانی کێـشەوبەرە دەکەوێتـە سەرشـانی ئیـسرائیلیەکان و فەلەستینیەکان. بەڵام کێشەوبەرەی لەم بابەتە نابێ بە سیفەتی بیانوویەك بۆ توندوتیژی لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەتان و هاووڵاتیان و دامەزراوە و کۆمپانیاکانی بەکار بهێنرێ.

* پاڵنەری هێندیك لە دەوڵەتان بۆ ئەوەی چاکسازیی لـە خۆیانـدا بکـەن، بـۆ ئەوەی بگۆڕێن بۆ کۆمەڵگای لیبراڵ، نموونەیـەکی باشـە لـە دەوڵـەتانی عیلمـانی کـە خاوەن زۆرینەییەکی موسڵمانن هەروەکو نموونەیەکی باشە بۆ جیهانیی ئیسلامیش.

* ئـەو جیهانـەی کـە لـە سـەر بـەهاکانی لیبڕالیـزم دامـەزراوە، باشـترین گـەرەنتی دادپەروەریی و ئاشتیی جیهانە، ئەو جیهانەی کە لە سەر بنەمای مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسیی و سەروەریی قانوون دامەزراوە و لەوێدا بازاڕێکی فرە جـۆر کـار دەکـا، هەرەشـەیەك لـە سـەر پەیوەندییەکانی خێزان و کۆمەڵگا و کەلتوور ئاین نەریتەکان پێکناهێنێ.

جیهانی لیبڕالیزم هەرەشەیە بۆ سەر دەمارگیریی و زێدەڕۆیی ئایینی و دیکتاتۆران و حکوومەتە نادیموکراسییەکان

ئەمە ئەم دەستوورەیە کە لە کاتی بەستنی کۆنگرەی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتیی لە شاری سۆفیا لە مایۆی ٢٠٠٥ هەموار کـراوە و پەسـند کـراوە ئـەم دسـتوورە بەڵگەنامەیـەکی رێکخراوی شێوە رەسمیی کارلێککردنی نێودەوڵەتیی کومنترنی لیبراڵیزمە

## ئامانجەکان

١- لیبراڵیزمی نێودەوڵەتی بریتیـە لـە یەکێتییـەکی نێـوان حیـزب و کۆمـەڵ و رێکخراو و تاکەکان کە لەسەر ئاستیی دەوڵەتانی جیهانی هاوکاری یـەکترین لەوانـەی کە پشتگیری لە پرەنسیپەکانی لیبراڵیزم دەکەن وجارنامەی لیرالیستیی ساڵی ١٩٤٧ و جارنامەی ئۆکسفوردی ١٩٦٧ و بانگەوازی لیبراڵیستی رۆمـا لـە ١٩٨١یـان قبـوڵ کردووە کە لە دووایيدا بەناوی بەڵگەکانی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتیی ئاماژەی بۆ دەکرێ.

٢-ئامانج لە بەدەستهێنانی قبوڵکردنێکی گشتیی بۆ پرەنسیپەکانی لیبراڵیزم کە هەر لە سرووشتی خۆیدا رەنگێکی نێودەوڵەتیی لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا هەڵگرتووە

هەروەها لە بەهێز کردنی گەشەی کۆمـەڵگای ئـازاد کەلەسـەر بنـەمای ئـازادیی تاکەکەسـی و بەرپرسـیاری تاکەکـەس و دادپـەروەری کۆمەڵایـەتیی دامـەزراوە خویدەنوینێ وێـڕای دابینکردنـی ئامرازەکـانی هاوکـاری و گۆڕینـەوەی زانیارییـەکان لەبـەینی رێکخـراوە ئەندامـەکان و ئافرەتـان و پیـاوانی ئـەو دەوڵەتانـەی کـە ئـەم پرەنسیپانە قبوڵدەکەن

## رێکخستن

٣- ئەمانەی خوارەوە قەوارەکانی جێبەجێکردن لە کومنترنی لیبراڵیزمدا پێکدەهێنن

***کۆنگرەی گشتی**

***لیژنەی جێبەجێکردن**

***کۆمسیۆنی نووسینگە**

## ئەندامێتی

### أ- ڕێکخراوی ئەندام

٤- ئەندامێتی لەبەردەم حیزبە سیاسییە نەتەوەییەکان، لەوانەی کە بەڵگەنامە بنەڕەتییەکانی کۆمنترنی لیبڕالیزم قبوڵ دەکەن، کراوەیە. هەروەکو ئەندامێتی بۆ ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیانەش کراوەیەکە دانیان پێدانراوە کە پێکهاتوون لە ئەندامە لیبڕالیستەکانی لاوان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی ئافرەتان کە بەڵگەنامە بنەرەتییەکان قبوڵ دەکەن لە ژێرباری هەلومەرجی تایبەتیشدا دەکرێ ئەندامێتیی بدرێتە ئەو کۆمەڵانەش کە حیزبی سیاسیی نین بەڵام ئەمە بەو مەرجەی کە بەڵگە نامە بنەرەتییەکان قبوڵ بکەن. بەڵام ئەو حیزبە سیاسیەی کە وەکو حیزبی سیاسی لە کارکردن دەوەستێ و دەگۆڕێ بۆ کۆمەڵە/کۆمەڵێك، پێویستە دووبارە نامەی داواکاری بۆ ئەندامێتی پێشکەش بکا

٥- ئەندامێتی لە لیبڕالیزمیی نێودەوڵەتیدا لەگەڵ ئەندامێتیی لەناو ڕێکخراوی سیاسیی نێونەتەوەیی دیکەدا ناکۆك دەوەستێتەوە لەژێر سێبەری هەلومەرجی تایبەتدا دەکرێ لقە هەرێمییەکانی ئەو حیزبە سیاسییانە بە سیفەتی ئەوەی کە کۆمەڵێکە و هەروەکو لە برگەی چوارەمدا هاتووە داواکاریی بۆ ئەندامێتیی پێشکەش بکا

٦- وا بە پەسند دەزانرێ کە لە هەر دەوڵەتێکدا کە حزبێکی سیاسیی تێیدایە و لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیی ئیقراری پێدەکا هەر ڕێکخراوێکی ئەندام لە لیبڕالیزمی نێو دەوڵەتیدا لەناوئەو دەوڵەتەدا لەپەیوەندییەکی توندوتۆڵدا بێت لەگەڵیدا

٧- هەر ڕێکخراوێکی ئەندام لە لیبڕالیزمی نێو دەوڵەتیدا وێنەیەك لە دەستووری خۆی لە ئەمینداریێتی گشتی هەمیشەییدا دادەنێ.

٨ — لیژنەی جێبەجێکردن بە زۆرینەی دوو لە سێی ئەندامانی ئامادەبوو بڕیار دەدا و ئەمەش لە ڕێگەی دەنگدانی نهێنی بۆ قبولکردنی داوای ئەندامێتی لە لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیدا، پاش پێشنیارکردنی لە لایەن کۆمیسیۆنی نووسینگەوە. ئەم



بڕیارەش بۆ پەسندکردنی بەرزدەکرێتەوە بۆ کۆبوونەوەی داهاتووی کۆنگرەی گشتی، ئەم کارەش پێویستیی بە زۆرینەی دوو لە سێی دەنگەکان هەیە.

٩- بەزۆرینەی دوو لە سێی دەنگەکانی ئامادەبوو لەکۆبوونەوەدا، لیژنەی جێبەجێکردن لە دەسەڵاتێك بەهرەمەند دەبێ کە دەتوانێ ئەندامێتی ڕێکخراوێك یان تەنانەت سێ ڕێکخراوی ئەندام هەڵپەرسێرێ. ئەمەش لە کاتێکدا دەبێ کە بۆی دەردەکەوێ ئەم ڕێکخراوە، بە شێوەیەکی گونجاو ڕای لیبڕالیستی لە وڵاتەکەی خۆیدا نانوێنێ، یان پشتگیریی دەنگدەران و بایەخی سیاسیی پێویستی لە دەستداوە لەوەی کە بە نوێنەرێکی کاریگەری بیروڕا لیبڕالیستییەکان دابنرێ، لە حاڵێکدا کە ئەم جۆرە وەزعەسەرهەڵدەدا ئەمینداری گشتی ڕاپۆرتێك بۆ کۆمیسۆێنی نووسینگە و لیژنەی جێبەجێکردن بەرزدەکاتەوە. لەبارەی مەرجەکانی هەڵپەساردنی ئەم ئەندامێتییەش، لیژنەی جێبەجێکردن بڕیار دەدا.

لیژنەی جێبەجێکردن، بە پەیڕەوکردنی هەمان ڕێوشوێن دەکرێ ئەندامێتی لە یەکێك لەو ڕێکخراوە ئەندامانە دابماڵێ. دەکرێ ئەم ڕێوشوێنە لە کاتێکدا وەربگرێ کەماوەی هەڵپەساردنی ئەندامێتییەکەیە. ڕێکخراوی ئەندامیش کە لایەنی پەیوەندیدارە، دەبێ بەلای کەمەوە ماوەی دوو مانگ پێش پێشنیاری داماڵینی ئەندامێتیی هۆشداریی پێبدرێ. ئەم بڕیارە لەسەر بنەمایەکی کاتیی، دەسبەجێ بەڕێوەدەبرێ، وێڕای بەرزکردنەوەی بۆ پەسندکردنی لەیەکەمین کۆبونەوەی داهاتووی کۆنگرەی گشتیدا. پیادەکردنی هەمان ڕێوشوێن لەسەر هەر ڕێکخراوێکی ئەندام لەگەڵ هاتنی ڕۆژی یەکەمی ئوکتۆبەر لە ساڵی ئێستادا جێبەجێ دەکرێ و لەوانەیە کە دانی ئابوونەی ئەندامێتی ساڵی ئێستا و ساڵی ڕابردووشی دواکەوتبێ. جا ئەگەر هاتوو حیزب بوونی نەبوو یاخود لە حاڵەتی وازهێنان لەوەزعییەتی خۆی بوو، جێبەجێکردنی ڕێوشوێنی داماڵینی ئەندامێتی، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە لایەن کۆمیسیۆنی نووسینگەوە جێبەجێدەکرێ بە مەرجێك لەلایەن لیژنەی جێبەجێکردنەوە بە زۆرینەییەکی ئاسایی پەسندکردن بکرێ.

١٠- كاتێك دەوڵەت لەرێگەی یەكێك لە حیزبەسیاسییە نیشتیمانییەكانەوە، دەبێتە نوێنەر، قبوڵكردنی ئەندامێتی رێكخراوێكی دیكە لە هەمان دەوڵەت رێگەی پێنادرێ تەنیا لەو حالەتەدا نەبێ كە رەزامەندییەكی نووسراو لە حیزبی سیاسی ئەندامەوە وەربگرێ. لەكاتێكدا كە رێكخراوەكی ئەم جۆرە رەزامەندییە بەدەستدەهێنرێ، لیژنەی جێبەجێكردنی. مافی ئەوەی هەیە بەزۆرینەی سێ لە چواری دەنگەكانی ئامادەبوو بریارێك وەربگرێ بۆ قبوڵكردنی ئەو داوایە، ئەم بڕیارەش بۆ پەسندكردنی بەرزدەكرێتەوە بۆ یەكەمین كۆبوونەوەی داهاتووی كۆنگرەی گشتی، ئەم كارەش پێویستی بەرەزامەندیی زۆرینەیەك بەرێژەی سێ لە چواری دەنگەكان هەیە.

١١- ئەندامێتی رێكخراوی دووەم لە هەر دەوڵەتێكدا، ئەو مافە دەداتە ئەو رێكخراوە ئەندامە كە لە لیژنەی جێبەجێكردن و كۆنگرەی گشتیدا، بەپێی تەرخانكردنی دەنگەكان كە لە دەقی بەندی ١٨ ب داهاتووە. نوێنەرایەتی هەبێ.

١٢- رێكخراوی سێیەم، یان هەر ژمارەیەكی تر لە رێكخراوەكان لە هەر دەوڵەتێكدا بێ، دەتوانێ ببێتە ئەندام لە لیبرالیزمی نێودەوڵەتیدا بە پێی مەرجەكان و وەزعەكان كە رێكخراو بۆ بە ئەندام وەرگرتنی رێكخراوی دووەم لە هەمان دەوڵەت دایڕشتووە.

## ب- ئەندامێتی تاكەكەس

١٣ — لەسێبەری هەلومەرجی نائاسایی دەشێ كە ئەندامانی تاكە كەس، لەوانەی كە كۆمیسیۆنی نووسینگە پێشنیاریان دەكا، ببنە ئەندام لە لیبرالیزمی نێودەوڵەتیدا بەپێی ئەم مەرجانەی خوارەوە:

أ — رادەی هەرەنزمی ئابوونەی ساڵانە لیژنەی جێبەجێكردن دیاریدەكا.

ب- ئەندامێتی تاكەكەس، بەو سیفەتەی كە لەو نوێنەرانەن كە مافی دەنگدانیان نییە، مافی ئەوەیان هەیە لە كۆنگرەی گشتی ساڵانەدا ئامادەبن، ئەوانە مافی دەنگدانیان نییە، تەنیا لە حاڵەتێكدا كە وەكو نوێنەری رێكخراوێك لە رێكخراوە ئەندامەكان، سیفەتی نوێنەری رێكخراوێكی پێبدرێ.



ج- ئەندامانی تاكەكەس، هەموو بڵاوكراوە دەورییەكانی رێكخراوەكەی بەبێ بەرامبەر پێدەدرێ، هەروەكو لە هەموو ئەو خزمەتگوزارییانەش بەهرەمەند دەبن كە رێكخراوەكە پێشكەشی ئەندامانی رێكخراوەئەندامەكانی خۆی دەكا.

د- هیچ ئەندامێكی تاكەكەس، مافی ئەوەی نییە وەربگیرێ بەبێ رەزامەندیی رێكخراوی ئەندام لە هەمان وڵاتی تاكەكەسەكە و هەروەها بەبێ رەزامەندیی لیژنەی جێبەجێكردنیش.

## ج – رێكخراوەچاودێرەكان

١٤ — دەشێ حیزبێكی سیاسی یان هەر رێكخراوێكی تر كە هاوسۆزیی لەگەڵ ئەو پرەنسیپانەدا هەبێ كە لە بەڵگەنامە بنەڕەتییەكانی لیبرالیزمدا هاتووە، پێگەی چاودێری بۆ ماوەی سێ ساڵ پێبدرێ. پێش كۆتاییهاتنی دوو خولی (دەورە) بەدوویەكدا، كە هەركامیان لە سێ ساڵ پێكدێ، وا پێویستە كەوئەو رێكخراوە داواكاری بۆ بوونە ئەندام پێشكەش كردبێت. لە حاڵەتێكدا ئەگەر داوای ئەندامێتی پێشكەش نەكردبێ، پەیوەندی ئەورێكخراوە بە لیبرالیزمی نێودەوڵەتیی دەسبەجێ رادەگیرێ. لە سێبەری هەلومەرجی تایبەتدا، دەكرێ پێگەی چاودێر بەو كۆمەڵانە بدرێ كە حیزبی سیاسی نین بەڵام بە مەرجێك بەڵگەنامە بنەرەتییەكانی قبوڵ بێت، بەڵام حیزبی سیاسیی كە بووەتە ئەندام، ئەوەی كە وەك حیزبێكی سیاسی كارەكانی رادەوەستێ،ئەوا دەبێتە كۆمەڵەیەك و هیچ گومانی تێدانییە دەبێ لە نوێوە داوای ئەندامێتی پێشكەش بكاتەوە وێرای جێبە جێكردنی ئەو رێوشوێنانە كە لە دەقی مادەكانی ٧ -٩ هاتوون. لە حاڵێكیشدا ئەگەر نەیتوانی رەزامەندیی حیزبێكی سیاسی نیشتیمانی بەدەست بهێنێ، ئەوا مادەی ١٠ جێبەجێ دەكرێ. رێكخراوە چاودێرەكان، مافی نوێنەرایەتیان هەیە بەڵام لە هیچ هەلومەرجێكدا مافی دەنگدانیان نابێت.

## د – رێكخراوە هاوكارەكان

١٥ — دەكرێ دامەزراوە سیاسییەكان یان هەر رێكخراوگەلێكی دیكە كە بەسیفەتی حیزبی سیاسی كارناكەن، بە سیفەتی رێكخراوی هاوكاری بەلیبرالیزمی

نێودەوڵەتییەوە پەیوەست بن. ئەم پێگەیە دەکرێ لە ڕێگای پێشنیاری کۆمیسیۆنی نووسینگە یان لیژنەی جێبەجێکردن بەزۆرینەی دوولە سێی دەنگەکانی ئامادەبووان، ببە خشرێ.

ڕێکخراوە هاوکارەکان دەکرێ نوێنەربن بەڵام لەژێرباری هیچ هەلومەرجێکدا مافی دەنگدانیان نییە.

## کۆنگرەی گشتی:

١٦ — کۆنگرەی گشتیی قەوارەی بنەڕەتیی یاسادانانی ڕێکخراوەکە دەنوێنێ و دەسەڵاتی ئاراستەکردنی هەموو ئەو سیاسەتانەی هەیە کە ڕێکخراوەکە دایدەڕێژێ.

١٧- کۆنگرەی گشتی بەلای کەمەوە هەردوو ساڵ جارێك دەبەسترێ.

١٨ — کۆنگرەی گشتی لەمانەی خوارەوە پیکدێ

**أ- بەرپرسەکان، کە ئەمانەن:**

- **سەرۆك یان سەرۆکەکان — ی شەرەف**
- **سەرۆك**
- **سەرۆك بەوەکالەت**
- **سەرۆکی پێشوو**
- **جێگرەکانی سەرۆك**
- **دوو ئەمین سندووق (زیاتر نەبێت)**

هەر حیزب یان ڕێکخراو یان ڕێکخراوێکی هاوکار کە ئەندامن، مافی ئەوەیان هەیە جێگر بۆ سەرۆك کاندید بکەن

ب- ژمارەی ئەو نوێنەرانەی کەمافی دەنگدانیان هەیە، بەلای هەرەزۆریەوە، بەرامبەر ژمارەی ئەو دەنگانەیە کە هەر ڕێکخراوێك لە ڕێکخراوە ئەندامەکان کاندید دەکەن. ئەو دەنگانەی کە هەقی هەر حیزبێك یان ڕێکخراوێکە بەجۆریە:

١ - پێنج دەنگی بنەرەتیی.



٢ - سەرەڕای یەك دەنگی سەرباری بۆ هەر ١٠٠ دەنگ یان بەشێکی گەورەی دەنگەکان کەئەم حیزبە لە دوایین هەڵبژاردنی گشتیدا هێناویەتی، ئەمەش وەکو رای هەرەزۆری تاکو ٢٠، ژمارەی سەرجەمی دەنگەکانیش ملکەچی ڕێککەوتنێکە بۆ نرخی بڕێکی سەربار کە ساڵانە حیزب وەکو ئابوونەی ئەندامێتی دەیدات و ئەمەش بەپێی حوکمەکانی مادەی ٤٢. ڕێکخراوە چاودێرەکان مافی ئەوەیان هەیە کەسێ نوێنەریان زیاتر نەبێ بەڵام ئەوەی بێ مافی دەنگدانیان هەبێ.

ج— ڕێکخراوە لیبڕالستییەکانی لاوان، ڕێژەیەك کەلە ١٠ نوێنەر زیاتر نابێ، کاندید دەکەن، سەرجەم ٢٠ دەنگیان دەبێ.

د— هەر ڕێکخراوێکی دانپێدنراوی نێودەوڵەتیی ڕێژەیەك کە لە ١٠ نوێنەر زیاتر نابێ، لە پەرلەمانتارە لیبڕالیستییەکان کاندید دەکەن، هەر ڕێکخراوێکیش ١٠ دەنگی هەیە.

هـ— ڕێکخراوە ئافرەتییەکانی نێو لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیی، ڕێژەیەك کە لە ١٠ نوێنەر زیاتر نابێ، کاندید دەکەن، سەرجەم ٢٠ دەنگیان دەبێ.

١٩- کاندیدکردن بۆ نوێنەرایەتی، پێویستە ڕێکخراوی ناوبراوی نرخی ئابوونەی ساڵانەی ساڵی پێشوو و ساڵی ئێستاشی دابێت.

٢٠ — فەرمانی ڕێکخەری فەرمانەکانی کە بەشێوەیەکی هەمیشەیی هەڵسوکەوت ڕێکدەخات لە کاتی کۆنگرەی گشتیدا، لیژنەی جێبەجێکردن ئامادەی دەکا و کۆنگرەی گشتی بڕیاری لەسەر دەدا.

٢١- سەرۆك لەلایەن کۆنگرەی گشتییەوە بۆ ماوەیەك هەڵدەبژێردرێ و بەردەوام دەبێ تا بەستنی کۆنگرەی گشتی داهاتوو، مافی ئەوەشی هەیە بۆ خولی داهاتووی سەرۆکایەتیش خۆی کاندید بکا، بەڵام بە مەرجێك کەسێ جاری لەسەریەك لە سەرۆکایەتیدا نەبێ تەنیا لە حاڵەتێکدا نەبێ کە کاندیدێکی دیکە لە ئارادا نەبێ بۆ پلەی سەرۆکایەتی. هەمان ڕێوشوێن لە هەڵبژاردنی سەرۆك بە وەکالەت و ئەمین سندوقەکان.

٢٢- جێگرەکانی سەرۆك و ئەمین سندوقەکان کۆنگرەی گشتی هەڵیاندەبژێرێ بۆ ماوەیەك کە تا بەستنی کۆنگرەی گشتی داهاتوو بەردەوام دەبێ، دەتوانرێ دووبارەش هەڵبژێردرێنەوە، بەڵام بە مەرجێك نابێ ئەمین سندوق سێ خولی بەدووایەکدا هەڵبژێردرێتەوە.

٢٣- لە حاڵێكدا ئەگەر یەكێك لە بەرپرسان لەكاتێكدا كە لە پلەی خۆیدا كاردەكات، خانەنشین بوو، ئەم پلە بەتاڵە، لەكاتی بەستنی یەكەمین كۆنگرەی گشتی داهاتوو، بە هەڵبژاردن پڕ دەكرێتەوە، ئەگەر هاتوو لیژنەی جێبەجێكردن وای بە باش زانی بەرپرسێك لە جێگای بەرپرسەكەی پێشوو دابنێ، ئەوا دەتوانێ بەشێوەیەكی كاتیی ئەم كارە بكات تا كاتی بەستنی كۆنگرەی گشتی ساڵی داهاتوو.

## لیژنەی جێبەجێكردن

٢٤- لیژنەی جێبەجێكردن لەمانەی خوارەوە پێكدێ:

أ — بەرپرسەكان وەكو لە مادەی ١٨ أ هاتووە

ب — نوێنەرێك لە هەر رێكخراوێك لە رێكخراوە ئەندامەكان، سەرەڕای ئەندامێكی زێدەكراو لە لایەن ئەو حیزبانەوە كە مافی ١٥ دەنگ یان زیاتری هەیە لەنزیكترین كۆنگرەی گشتی.

ج — دوو نوێنەر كە رێكخراوە لیبراڵیستییەكانی لاوان كاندیدیان دەكەن.

د- نوێنەرێك لە رێكخراوێكی دانپێدانراوی نێودەوڵەتیی لە پەرلەمانتارە لیبراڵیستییەكان.

ه- دوو نوێنەر كە رێكخراوە لیبراڵیستییەكانی ئافرەتان كاندیدیان دەكەن.

٢٥- لە سەر بنەمای داوەتنامەیەك كە لیژنەی جێبەجێكردن پێشكەشی دەكا، دەكرێ هەر رێكخراوێكی هاوكار یان چاودێر بە یەك نوێنەر بەشداریی بكا كە مافی قسە كردنی هەیە بەلام مافی دەنگدانی نییە.

٢٦- سەرۆكی رێكخراو كە پلەی سەرۆكی لیژنەی جێبەجێكردن دەگێڕێ، لە حاڵێكیشدا ئەگەر خۆی ئامادە نەبوو، سەرۆكی بە وەكالەت یان یەكێك لە جێگرەكانی سەرۆك، سەرۆكایەتی لیژنەی جێبەجێكردن وەردەگرێ.

٢٧- ئەو نوێنەرانەی كە لە بەندەكانی ٢٤ب، ٢٤ه باسیانكراوە، رێكخراوە ئەندامەكان بۆ ماوەی یەك ساڵ دیارییان دەكەن. رێكخراوە ئەندامەكانی دەتوانن نوێنەرانی خۆیان بە (وەكالەت)یش دیاری بكەن. لە حاڵەتێكدا ئەگەر نوێنەر بە (وەكالەت) لە كۆبوونەوەدا ئامادەبوو، ئەوا بێ سێوو دوو دەبێ ئەمێندارێتی گشتیی پیشوەخت بە نووسراو لەمە ئاگادار بكرێتەوە.



٢٨- لیژنەی جێبەجێكردن بۆی هەیە، چەند نوێنەرێك كە لە دوو كەس زیاتر نەبێ، لە كەسایەتییە لیبراڵیستییەكان لەوانەی كە سومعەیەكی نێودەوڵەتییان هەیە و هیچ رێكخراوێك لە رێكخراوە ئەندامەكان دیاری نەكردوون.

٢٩- لیژنەی جێبەجێكردن بە لای كەمەوە ساڵی دووجار كۆبوونەوە دەكا، بە گوێرەی تواناش وا بە پەسەندتر دەزانرێ كە دوو كۆبوونەوەی بە دوای یەكتردا لە یەك دەوڵەتدا ئەنجام نەدرێ.

٣٠- لیژنەی جێبەجێكردن بەرپرسی سەرپەرشتیكردنی كاری رێكخراوەكەیە لە ماوەی سالآنی بەستنی كۆنگرەی گشتیدا. مافی ئەوەشی هەیە بریار لە سەر سیاسەتەكان بدات و دەستبكا بە دەستپێكشەریی نوێ و هەروەها بەرپرسیاریی كاروباری دارایش دەخاتە سەر شانی.

٣١- لیژنەی جێبەجێكردن مافی هەیە لیژنەی لاوەكیی تایبەت دیاری بكا بۆ مامەڵە كردن لەگەڵ كێشەكانی رێكخراوەكانی، یان پلاندانان بۆ چالاكییەكانی، یان مامەڵە كردن لەگەڵ ئەو بابەتە سیاسیانەی كە بۆ حیزبە ئەندامەكانی لیبراڵیزمی نێودەوڵەتیی گرنگییەكی هاوبەشیان هەیە، سەرۆكی ئەو لیژنە لاوەكییە و ئەندامەكانی، لەلایەن لیژنەی جێبەجێكردنەوە دیاریدەكرێن و ئەوانیش لە لای خۆیانەوە راپۆرتی بۆ بەرز دەكەنەوە.

٣٢- لیژنەی جێبەجێكردن بنەماكانی رێوشوێنی وەرگرتن و بنەماكانی كۆمسیۆنی نووسینگە و ئەمین سندووقەكان و ئەمیندارێتی گشتیی هەمیشەیی دادەرێژێ.

## كۆمسیۆنی نووسینگە

٣٣- كۆمسیۆنی نووسینگە لەمانەی خوارەوە پێكدێ:

- **سەرۆك یان چەند سەرۆكی شەرەف**
- **سەرۆك**
- **سەرۆكی پێشوو**
- **سەرۆك بە وەكالەت**
- **جێگرەكانی سەرۆك كە لە شەش جێگر نابێ زیاتر بن.**

کۆنگرەی گشتیی بۆ ماوەیەك هەڵیاندەبژێرێ کە بەردەوام دەبێ تا کاتی بەستنی کۆنگرەی گشتی داهاتوو

* **ئەمینداری گشتیی**
* **ئەمین سندووق**

پاش هەڵبژاردن، ئەگەر ئەندامەکانی کۆمسیۆنی نووسینگە (جگە لە ئەمینداری گشتیی) بە لای کەمەوە یەك ئەندامی لە هیچ کام لەو ناوچانەی خوارەوە (ئەفریقا، ئاسیا و ئوقیانووسی ئارام، ئەوروپا، ئەمریکای لاتینی، ئەمریکای باکوور)تێدا نەبوو، لیژنەی جێبە جێکردن، پاش راوێژ کردن لەگەڵ حیزبە ئەندامەکانی ئەو ناوچانە، بانگهێشتی چاودێرێك کە مافی دەنگدانی نییە، بکات تاکو لە کۆبوونەوەکانی کۆمسیۆنی نووسینگەدا ئامادە دەبێ.

٣٤- کۆمسیۆنی نووسینگە بەرپرسیارە لە هەموو کاروبارە کارگێری و داراییەکان راپۆرتەکان بۆ ئەو بەرز دەکرێنەوە و ئەویش بۆ پەسند کردنیان پێشکەشی لیژنەی جێبەجێکردنی دەکا کە بەلای کەمەوە یەك جار لە ساڵێکدا دەبێ.

٣٥- کۆمسیۆنی نووسینگە بەرپرسیارە لە هەموو کاروبارە سیاسییەکان کە لە ماوەی نێوان کۆبوونەوەکانی لیژنەی جێبە جێ کردندا دێنە ئاراوە.کۆمسیۆنی نووسینگە مافی ئەوەی هەیە کە درکاندنی گشتی لە بارەی ئەو کاروبارانەوە رابگەینێ کە پەیوەستن بە سیاسەتەوە ئەگەر هاتوو ئەمەی بە پێویست زانی. هەروەها کۆمسیۆن راپۆرتێکی نووسراو لە بارەی کۆبوونەوەکانی خۆی لە ماوەی ٣٠ رۆژدا بۆ لیژنەی جێبەجێکردن بەرز دەکاتەوە. ئەم راپۆرتە ملکەچی گفتووگۆی کۆبوونەوەی داهاتووی لیژنەی جێبەجێکردن دەبێ بۆ ئیقرار کردنی.

## سەرۆکی شەرەف

٣٦- کۆنگرەی گشتیی، لە سەر پێشنیاری لیژنەی جێبە جێکردن، دەکرێ سەرۆکێکی پێشوو کە دەستێکی باڵای لە بواری خزمەتی لیبڕالیزم و لیبڕالیزمی نێو دەوڵەتیدا هەبووە، بە سیفەتی ئەوەی سەرۆکێکی شەرەفە دیاریی بکا.



## چاودێران:

٣٧- کۆنگرەی گشتیی، لە سەر پێشنیاری لیژنەی جێبەجێکردن، دەکرێ کەسانێك لەوانەی کە چالاکیی بەرچاویان لە واری هزرو کاری لیبڕالیستیی و چالاکیی لە لیبڕالیزمی نێو دەوڵەتیدا هەبووە دیارییبکا بە سیفەتی ئەوەی کە چاودێر بوون. چاودێران، لە کاتی کۆبوونەوەکانی لیژنەی جێبەجێکردن و کۆنگرەی گشتیدا، مافی ئامادە بوون و قسەکردنیان هەیە و لە کاتی بەستنی کۆنگرەی گشتیدا مافێکی کەسێتیان هەیە کە دەنگبدەن.

## ئەمینداریێتی گشتی هەمیشەیی

٣٨- ئەمینداری گشتیی بەو سیفەتەی کە وەکو فەرمانبەر لە رێکخراوەکەدا کار دەکا، سەرۆکایەتیی ئەمینداریێتیی گشتیی هەمیشەیی دەکا. ئەمینداری گشتیی لە سەر پێشنیاری کۆمسیوونی نووسینگە، لیژنەی جێبەجێکردن دیاریدەکا و کۆنگرەی گشتیش لە یەکەمین بەستنی خۆیدا پەسندی دەکا.

٣٩- ئەمینداری گشتیی، دەستەی کاری یارمەتیدەری خۆی بە رەزامەندی لیژنەی جێبەجێکردن دیاریدەکا.

٤٠- بارەگای سەرەکی رێکخراوەکە لەو دەوڵەتەدا دەبێ کە لیژنەی جێبەجێکردن هەڵیدەبژێرێ واش پەسەندترە کە بارەگا لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر، تەنیا پاش تێپەڕ بوونی پێنج ساڵ بە سەر مانەوەی لەو دەوڵەتەدا، بگوازرێتەوە.

٤١- ئەمینداری گشتیی، راپۆرتی خۆی لە بارەی چالاکیەکانی لیبڕالیزمی نێودەوڵەتیی، بۆ کۆنگرەی گشتیی بەرز دەکاتەوە.

## دارایی:

٤٢- رادەی هەرە نزمی ئابوونەی ساڵانە بۆ هەر رێکخراوێك لەو رێکخراوەکانی ئەندام و هەر رێکخراوێك لە رێکخراوە چاودێرەکان، لیژنەی جێبەجێکردن دیاری دەکا. هەر

ڕێکخراوێکی ئەندام و هەر ڕێکخراوێکی چاودێر بــە پێــی قــەوارەی خــۆی بڕێکــی تەواوکارانــە دەدات نرخی بری تەواوکاریی لە ساڵێکدا، بە ڕێککەوتن لەگەڵ ڕێکخراوی ئەنــدام و ڕێکخــراوی چاودێردا دیاریدەکرێ. ئابوونەی ساڵانە دەبێ لە یەکی ینایری هەموو ساڵێکدا بدرێ.

٤٣- ڕێکخراو بۆی هەیە حیساب لە بانکەکانی هەموو دەوڵەتاندا بکاتــەوە کــە ئەنــدام تێیدا، بەلام حیسابی سەرەکیی لەو دەوڵەتەدا دەمێنێتەوە کە بارەگای ئەمینداریێتی گــشتیی هەمیشەیی لێیە. ئەمین سندووقەکان یان ئەمینداری گشتیی مافی ئەوەی هەیە کە مامەڵــە لەگەڵ هەموو حیسابە بانکییانەدا بکاو یان هەر بەرپرسێك یــان ئەمینــداری گــشتی بکاتــە وەکیل لە مافی مامەڵە کردن لەگەڵ ئەو حیسابانەدا.

٤٤- ساڵی دارایی ڕێکخراو لە یەکی ینایرەوە بەردەوام دەبــێ تــا دەگاتــە ٣١ دیــسامبەر. حسابەکانی ڕێکخراو ملکەچی پێداچوونەوەی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی حساباتەکان دەبــێ لــە کۆتایی هەر ساڵێکی داراییدا وپاشان ئــەو حــساباتانە کــە ملکەچــی پێداچــوونەوە بــوون، بــۆ پەسەندکردنیان بەرز دەکرێنەوە بۆ کۆبوونەوەی داهاتووی لیژنەی جێبەجێکردن.

## گۆرانکارییەکان

٤٥- ئــەو هەمــوارکردنانــەی دەچــنە نــاو ئــەم دەســتوورەوە، کــۆنگرەی گــشتیی سەرپەرشــتییان دەکــا ئەمـــەش بــە پێــشنیاری کۆمــسیۆنی نووســینگە بــۆ لیژنــەی جێبەجێکردن دەبێ کــە دەکــرێ بــە زۆرینەیــەکی ئاســایی، یــان بــە پێــشنیاری هــەر ڕێکخراوێك لە ڕێکخراوە ئەندامەکان، ئەنجامبدرێ و پێویستشە کــە ڕەزامەنــدیی دوو لە سێی دەنگەکانی ئامادە بووان بە دەست بهێنرێ.

٤٦- بێ سێو دوو دەبێ پێش ١٠ هەفتە نووسراو لــە بــارەی نییــەتی پێــشنیاری هەموار کردن بۆ هەموو ڕێکخراوەکــانی ئەنــدام بنێــردرێ. پێویــستە کــە گفتوگــۆ و دەنگدان لە بارەی پێشنیارەکانی هەموار کردن لــە کــاتی کۆبوونــەوە کارگێڕییەکانــدا بەڕێوە بچێت و ئەو گۆرانکارییانەی کە دەچنە نێو دەستورەوە ئەوا هەر لەگــەڵ تــەواو بوونی کۆنگرەی گشتیی کاراو ئیلزامیی دەبن.